شیعر



لادزۆ

سەباح ڕەنجدەر

لۆنەر موور

ئیدریس عەلی

شامیرانی
دوای ڕاپەڕین



تەرزە جاف

چیرۆک



سادق هیدایەت

سینەما



پاشەڕۆژی سینەما
گەڕانەوە بۆ خەون

## ئەنتەلۆگیای بێدەنگی



ڕەوف بێگەرد
عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا
شێرزاد حەسەن
ئەنوەر ڕەشید عەولا

## کتێبەکان



لاش نۆرێن لە شەوێکی فەلسەفیدا
حیکایەتخوانی شەو
زنجیرە کتێبی توایلانیت

## لێکۆڵینەوە



گازینۆی منداڵان

## دوو چیرۆك



عەتا موحەمەد
جاك لەندەن

## ئەدەبی سەفەر



سەردار عەزیز

## گفتوگۆ



ئیڤ ئینسلەر/ لە کیژۆڵەیەکی
لاقەکراوەوە بۆ ئازادیخوازێك

Poetry

لازۆ
سەباح ڕەنجدەر
ئۆنەڕ موور
ئیدریس عەلی





# کتێبی نووسینەوەی
# هەزارویەك خەون

لازۆ

(١٠٠١)

دنیا گەرم بوو
خۆر کەوتبووە سەر چیمەنتۆی سوور
بەبەر چاوی مسگەرەکانی کۆڵانەوە هاتیت
ئەو پیاوانەی پێستی سپی دەیترساندن



خۆر گەیشتە ناو ئینجانەکان
ڕووناکی بە دەماری باخچەدا ڕۆ چوو
چیمەنتۆی سوور داغ بوو

بە کراسێکی ڕەشەوە
تۆ دەرکەوتیت

لەودیو ماڵەکەی منەوە
سەموونفرۆشەکە هاوار دەکات و
من و تۆ دەنگمان لەگەڵ ئەودا ون
دەبێت
میوەفرۆشەکە بۆنی کاڵەك لە
دەمی دێت
من لە بری کاڵەك زمانی تۆ دەخۆم
کوتاڵفرۆشەکە مەترێك
قوماشی نیپاڵی
دەدات بە سکێکی بازنەیی
هەوا لە ژوورەکەمدا دەتاسێت
دەستی تۆ
لەسەر یەکەم قۆپچەی کراسەکەمە،
تێکەڵ دەبێت لەگەڵ ماستفرۆش و
سەوزەفرۆشەکان سەدای تۆ،
مەلا دەنگخۆشەکەی کۆڵانی ئێمە
بانگ دەدات و
پانتۆڵەکەت لەسەر کەمەرت دەترازێت



قۆپچەی کراسی ڕەشت
لەناو دەستی مندا سەرگەردان
زەوی سووڕی خۆی تەواو دەکات
خۆر لە ناوەڕاستی سینەمە
من و تۆ سووڕێکی خەوتن تەواو دەکەین
تۆ نیوەی دەرگەکەت کردووەتەوە
پاژنەت لەسەر تاکێك لە پێڵاوەکانتە
ماچێك بە سەری پەنجەکانت دەنێریت
پیاوانی گەڕەك لێت دەڕوانن
ئەوانەی پێستی سپی وەك مەترسی دەبینن
من لەمدیو پەنجەرەکانەوە
بیر لەوە دەکەمەوە
دەنگی پێڵاوەکانت
لەودیو دەرگەکەم
سەدای هەیە
لەناو دەنگی زبری شاردا
ون دەبن
هەنگاوەکانت
تۆ مەعشووقی کۆچەریی منیت

## (١٠٠٠)

دڵم
بەوە دەلەرزێت



بەوە بزە دەیگرێت
کە چاوەکانت تەڕ دەبن و
بۆینباخەکەت شل دەکەیتەوە

## (٩٩٩)



دیواری ژوورەکەم درزی بردووە
سیسەمە دارینەکەم بۆنی پێستی لێ دێت
کتێبە زەردەکانم لەسەر زەوی پەرێشان
گۆزەیەکی شکاوی شەراب و
ملوانکەی مێخەکم ئەڤین دەگۆڕنەوە
جامێکی ستیل لە تەنیشتمەوە
لێوی دەلەرزێت

من ژوورەکەمم خۆش دەوێت
ئەوکاتانەی دەنگی درزی دیوار و
سیسەمی دارین و پەڕەی زەردی کتێب و
گۆزەی شکاو دێت
ئەوکاتەی بە دوو لێوی گەرمەوە
جامی ستیل بەتاڵ دەکەینەوە
سەرمان لە یەکتر نزیك دەکەینەوە و
دەیکەین بە ئاوێنە

# (٩٩٨)

تۆ هەزاران سێبەرت هەیە و
وەك برا بەسەر پیاوەکانی دنیادا
دابەشت کردوون
من لەسەر ئەم زەوییە
حەزم لە هەزارە و
تاکوتەنیا ئەڤینداری تۆم

# (٩٩٧)

کچێك لەناو مندایە
خوشکی بچووکی تۆیە
گۆرەوییەکانت دەشوات
ژنێك لەناو مندایە خەون دەبینێت
دەزگیرانت بێت
کراسی سپیت بۆ دابکەنێت
ئەستێرەی بچکۆلەی سوورت
بداتێ

گەر لەگەڵ تۆدا
پیر نەبووم
حەز



دەکەم دایکت بم
دڵم لات بێت،
بۆت بگریم و
هێندە خەمت لێ بخۆم
پرچەکانم سپی ببن
لەسەر گۆڕی پیاوچاکان
بۆت بپاڕێمەوە
خودا مرازی دڵت حاسڵ بکات
کوڕەکەم!



## (٩٩٦)

بە پەنجەکانی
قردێلەی قژمی کردەوە
پارچەیەك قوماشی ئاوریشم
کەوتە سەر زەوی
مێروولەکان ژوورەکەیان بەجێ
هێشت



## (٩٩٥)

پێم مەڵێ دنیا گەورەیە
دەستت بەر هەر ژنێك بکەوێت

جێپەنجەکانت لەسەر گەردنی من
دەردەکەون

## (٩٩٤)

بیر لەوە دەکەمەوە
چەند جار زنجیری تەنوورەکەم
قۆپچەکانی کراسەکەم
بەو پەنجانەی تۆ
دەکرێنەوە و
دەترازێن و
دادەخرێنەوە
تۆ
هەر هیچ نەبێت
شتێك بڵێ
بۆ ئەوەی کەوتنەخوارەوەی
جلەکانم بۆ سەر زەوی
تاکە دەنگێك نەبێت
من گوێم لێی بێت،
مەسیحی من!





# ١

نووح بەچاوی خەواڵووەوە چووە بەر ئاوێنە
بە جۆشی ئاکام و هەڕەشەوە گوتی
سەباح ڕەنجدەر
تەمەنی من
لە تەمەنی تۆ
گەورە و دنیادیدە ترە
بۆ ئەوەی لەوە زیاتر دڵم نەشکێ
بەرژەوەند وا دەخوازێت لە یەکتر ون بین
کە دوایین هەناسەش دەدەین
بیر لە یەکتر بکەینەوە
دوو برادەر بووین لە یەکتربینیندا دەترساین

نووح زیاتر بمێنێت دەبێ بە چی و چیتر ڕوودەدات
ملوانکەیەك لە ملی بەردی بن دۆڵ دەدۆزێتەوە
دەنکەکانی پێ  ناژمێردرێت
ئاوێنەش گیر دەخوات بە دەستی دەموچاوەوە
دڵی پێیان دەگوشرێت
تەنیا لە تەمەن زۆریدا شاخی کەڵەکێوی جوان دەبێ
زەنگ و دەف
لەناو لکەکانی شاخی کەڵەکێوی
یەکتر دەناسن و ڕووخۆشی بۆ یەك دەنوێنن
داواکاری ئەشق          و
خەڵاتی دیدار          و
مەئوای جاویدانی          و
خەرمانی خودایی
خۆشەویستی نێوان کۆتر و دانەوێڵە
تا ئەوپەڕی بوون پشکوتووە
کۆتر لەسەر گۆگردی داغ پێیەکانی جوان دانانیشن
ڕوخساری یەکەمی سروشت بزەیەك دەکات
بەو بزەیە دەگەڕێینەوە ماڵەوە

# ٢

باڵی فریشتە لە بەرزبوونەوەیدا چۆنە و چ دەبەخشێت
لە دابەزینیشی هەمان
گۆڕانکاری لە ڕووناکیدا
سبەینە ڕەنگێك



نیوەڕۆ ڕەنگێکی تر
دەمەو ئێوارە تێکەڵەیەك لە هەردووکیان دەدرەوشێتەوە
شووشەم لە پەنجەرە گرتەوە
سەرنجی شەختە دەدەم
کاتێ درز دەبات و دەکەوێت
کەروێشکی ناو تەڵە
لە چەقۆ نزیك بووەتەوە
چاوێك بە زەویی دەوروبەری خۆی دەگێڕێت
من هەڵە بووم
ئەوە ڕێگا نەبوو پێیدا چووم
بگەڕێمەوە لانە
دەنگە عەنبارکراوەکانی باپیرانم لە ئاسمان دەگەڕێنەوە لام
هەست بە هەموو شتێك بکە



٣



لە لەدایکبوونم داپیرم ناوچەوانی بە ئاوی پیرۆز تەڕ کردم
گۆڵاوی بەرکانی
ڕەنگی ئاوی خدری ناسیوە
کە ڕەنگی ئێمەیە
ئێمە ئەو کەسانەین لەناو کەشتیی نووح نوێژمان کرد
لە کەنار نوێژمان کۆتایی پێ نەهێنا
درووود بۆ ئەو خاکە پاکەی کەنار
نوێژی لێ دێ

دوای هەورە تریشقە دابەزین
مێرگ گوڵەکانی کەوت
بێدەنگ مایەوە
بە هۆشێکی تاسەدارەوە
بیبەرێکمان خستە دەممانەوە
بۆ ئەوەی لە لێکدانەوەی هێڵەکانی ناولەپمان خەواڵوو نەبین
هەڵێنانی هێما و ڕازی ناولەپ
گۆڕەپانی جەنگە پاڵەوانی تێدا دەشکێ

## ٤

کوللە
هێشتاکەش ئومێد و هەتاو لەسەر ناوچەوان لادەدەیت
گوللە
هێشتاکەش لە شکستدا ڕەش هەڵدەگەڕێی و دووکەڵی شۆڕبووەوەی
بنمیچی
زللە
هێشتاکەش گەرمایی لە ڕوومەت دەمرێنی و خەڵاتت خاڵی خوێنی
مەییوە
کەللە
هێشتاکەش ڕێگاکان بە لکی زۆرەوە تێتدا ئاوەدان
دەبنەوە
منیش هێشتان بەدەوری جەستەی گەرم و زیندووی خانمی شیعر
دەخولێمەوە
خانمی شیعری ئەمەکدارم بە



لە مردندا لێوەکانم بکەرەوە فەرموودەی ماوم دەبیستیت
شیعر بەخێرهاتنی باوکە ئادەمی کردووە
لانکی دایکە حەواشی ڕاژاندووە

## ٥



ڕۆژ لە خەوی گرانی ما هەڵنەهات
ڕووناکی دڵ و گیانت بە چراکەمەوە هەڵدەواسم
شەوی بێ بەیان
ئەستێرە و مانگ بێ سەروشوێن نین
بیرەوەری زەوین و شەپۆل دەدەن

ڕوون و
ئارام و
هێمن و
پڕتاسە



وەك ڕوومەتی ئاسۆ بە بۆنی گزنگ
بێ پرس تا ئەوپەڕی مەستی بە دوایاندا دەڕۆم
ئەستێرە و مانگ هاتنە خوارەوە و لەگەڵمدا پیاسە دەکەن
ئەوین بە شەقامەکاندا ڕژا

نواڵە لە چیاکانی بەهەشتەوە
دێتە خوارێ و بەو ناوەدا تێدەپەڕێ
ئەشق لەبن حەوت پەڕەی دڵ و گیان
دەدوێ و  قسەی شەیدابوونی خۆیت پێ دەڵێ
سێوی نەخواردووی پێیە

زەوی لە ڕۆژ نزیك دەبێتەوە
تین و توانای خەمڵین لە خۆر وەردەگرێت
بای کۆچەری
بای سەرخۆش لە سەروپرچی  درەختی دەنگخۆش لادەدا
ئاگرێك چا و نانی لەسەرە
خەریکە خامۆش دەبێت
ڕوخساری چا و نان بەو ناوەدا دەسووڕێنەوە
خێزانێك ڕۆشنایی دەمژن و گەرم دەبنەوە
شتێك دەبینن دەفڕێت و سێبەریان لەسەر دەکات
شتێك هەموومان دەتوانین بیکەینە باڵی خۆمان

## ٦

فاڵگرەوەیەك ڕێنمایی کردم
لە ساڵی مردنی دایناسوورێکی نەرمونیاندا
مۆم لەسەر کێلی بگرێنم
مار تاجیش لەسەر بکات
ژەهر لەبن تاجەکەی نامەبەرە
دەڕژێتە حەوزی دەستنوێژگرتن
نامە تەنیا باڵندەی خۆشخەبەر نایهێنێت
ناسینی بەهار دژە ژەهرە و نامە بزەیەکی  بەخشندەیە
دەمانباتە خەونێکی هێمن و ئاکاری شەرمنی گوڵەوە
دەرکەونەوە ئاکاری شەرمنی گوڵ دەرکەونەوە
ئاواز لە گۆرانی نادزرێت
ئەسپ بە بۆنوبەرامەی سواران دەگەڕێنەوە



# ٧

دوای چل شەو و چل ڕۆژ باران بارین
کەشتیی نووح لەپێش ماڵی ئێمەدا گیرسایەوە
سەرنشینەکان

سەرگەردان و
وەڕس و
مات و
لارەمل کەوتن



فەرموون ئاگری دلۆڤانیم بۆ کردوونەتەوە
لە دەوری ئاگر گەرم بوونەوە
هەموو ئەو شتانەم پێشکێش کردن
کە خوداوەندەکان پێشکێشی دەکەن
دوای ئەوەی دەماریان توند بووەوە
دەستیان بۆ چاویان برد
زانیم شتێکی ئەوتۆیان لە یادەوەری لە بیر نەماوە
لە ماڵی مندا فێری دەمودوو بوونەوە
توانییان دووبارە بیربکەنەوە و ژمارەی
کاتژمێرە هەڵواسراوەکان بخوێننەوە
ژیان ئازاد و پڕ لە ئارەزوو بە پێشماندا
هاتە پیاسە و خۆشڕوویی نواند
تەماشای قووڵیی دەمار و خوێن و گۆشتیمان کرد
بە خێرایی تیرێك

پەڕوباڵ بۆ فریشتە تاقانەکان گەڕایەوە
کاسەی زێڕین پڕ بووەوە و بەرەو سەرەتا بووینەوە
خانمی خامۆشی پرچی لە تیشکی فانۆس زەردترە

ناوونیشانەکان

١:هەڕەشەی نووح
٢:گەڕانەوەی دەنگی باپیران
٣:هێما و ڕاز
٤: چوارین و من
٥: درەختی دەنگخۆش
٦:ئاهەنگی ساڵی مردنی دایناسوور
٧:پڕبوونەوەی کاسە



# خۆشەویست

**ئۆنەر موور**
**و. لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن**

لە شەوێکی درێژدا
لە میانەی دوو خەوندا میوانم بوویت
هەر لەو رۆژەدا کە پرسەی خۆت بوو ..
کەچی چاپووك و زیندوو.. روون و ئاشکرا ..
سەرگەرمی دوا ڕاو رەسمی وەرێخستنی تەرمی خۆت ..
سڵاو و چاکوچۆنی و خێرهاتنی میوانەکانت
لە ژوورێك ڕۆشنایی خۆڵەمێشی و پەنهان تێرژاو ..



له شوێنێکدا که بۆ ڕۆژێکی واهی تەواو نەشیاو بوو.. وەلێ تاوێك و
تین و تاوی هەتاو دارژاو..
دیوارەکان بە رەنگی قۆخ یان قەیماغ وەرگەڕان..
لەولاوە لەسەر سەکۆکە دارەبازەیەك بە رەنگی تەباشیر..
چاوەڕوانی تۆیە.
لەوە دەچوو کەسکت پۆشی بێت، سەوزێکی بەهاری ..
قۆڵ درێژ.. سەوزباو ..
یەکاندەردوو.. لە چەخماخەیەکدا تۆ وەك خانمێك دەتنواند
وەك من مەزەندەی بکەم لە شێوەی دایکت بووبێت ـ
بە سەر و پرچێکی ڕەشەوە.. دوو برۆی پەیوەست و گۆشەدار..
بە نێو نیگای یەکلاییکەرەوە.. نێوچاوان گرژ
سەرسام و ئەبڵەق..!

هەموو ئەوانەی دەیانناسین ئامادە بوون..
کەسانێك کە من نەمدەناسین..
شاعیرێکی هاوڕەگەزباز و مەزن، کە هەنووکە پیر و درێژ دەینواند..
ڕووخسارێکی گەش.. چاوێلکە لە چاو.. شاڵ لەبەر..
شاڵێکی بە دەست چنراو .. قاوەیی و «سینایی»
کە لە سەر و ملییەوە ئالا بوو.. هەر وەك ئەوەی ژنە
عەرەبێك بێت
تۆ لە ئامێزت گرت. ئەوەیان یەکەمجار بوو کە
من پیاوێك ببینم..
پیاوێکی دیکە ماچ بکات و بە
«خۆشەویست» و یار بانگی بکات



منیش بەوە سەرسام بووم کە چی واتان لێدەکات..
واهی و سۆزبارانە لە یەکدی ڕابمێنن..
رێك لەسەر رۆخانەی مەرگدا




لە ناکاو کەس لەو ژوورەدا نەما.. لەو حەوشەیەدا
کە تەرمەکەی لێبوو.. کە مەرگ تیایدا سەروەر بوو..
هیچ کەسێك.. بێجگە لە من و لە تۆ.
هاوکات تەرمەکەش.. کە بەسەر ئاوەوە دەلەنگییەوە..
ئاوێك کە شینێکی کاڵ دەینواند..
تەرمەکەش لەوەدا بوو شی ببێتەوە..
وەك شتێکی لە بار بۆ توانەوە کە لێکدی هەڵبوەشێتەوە..
وای لە تۆ.. وای.. بەو هەموو نەخۆشی و لاوازیتەوە.. باریك و بنێس
هەنگاو بە هەنگاو ڕووەو ئاوەکە دەخزایت..
کە تا ئاستی ڕانەکانت هەڵکشابوو..
بەدەم بێزاری و دڵشکانەوە.. لە تاو رەنج و کۆشش و تەقەللایەکەوە
زێدە کوشندە.. کە خەریك بوو دەگریایت..
لە هەوڵی بێ وچان کە تەرمەکەی خۆت لەو ئاوەوە دەربهێنیت
بەو مەرامەی کە نەهێڵیت هەلاهەلا بێت و هەڵبوەشێتەوە.
من لە تۆ ڕادەمام.. تاوێك و پاشتر خۆم لە تەك تۆدا بینی..
من و تۆ لە ئاوەکەدا.
پێکەوە سەرمان دەردەهێنا و دەلەنگینەوە..!

من لە ناو گەرمەی خەونێکدا ڕادەبم
وەلێ وێڕای ڕۆشنایی بەرەبەیان
هەمدیس دەکەوەمەوە ژێر باری خەوێکەوە
تۆش هۆ لەوێدا وەستاویت.. تا رادەیەك سەرحاڵ دەنوێنیت
بە پڕتاو بە قاڵدرمەکەدا سەردەکەویت.
هاوزەمان کە من و تۆ پێکەوە رووەو ژوورەکە هەنگاو دەنێین..
من خەونەکەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە..
لەمەڕ ئەو شاعیرە کەڵەگەت و
هاورەگەزبازە..
تەواو پیر و خەڕۆ.. دیار و بەناوبانگ لە ژێر شاڵەکەیدا..
کە تۆی لە ئامێز گرت.. تۆش توند گوشیت بە خۆتەوە..
بە خۆشەویست و دۆستی ئازیز بانگت دەکرد.
ئۆە... تۆ دەژنەویت.. بەدەم خەندەیەکی تەریو و تۆراوەوە
هەر دوو باسکت لە باڵامەوە دەئاڵێنیت..
بەرزم دەکەیتەوە و هەڵمدەگریت و ڕامدەفڕێنیت
ئەو کاتەی من نایخوازم و مان دەگرم و قایل نیم:
من ناخوازم هەڵمبگریت.. لەوەدایە بمریت
پشتی خۆت بشکێنیت»».

هەنووکە بە بەرگێکی کەتانی شڕەوە..
..چەندە لە منداڵێکی بەردەست دەچیت
هەر وەك ئەوەی خۆت بۆ نمایشێك
ساز کردبێت.





خۆشەویستەکەم.. من کەوتمە سەر ڕێگای پیاوێك
چ پیاوێك .. هەر کە دەستی لێدام و .. داگیرسام
من سیپاڵێکی جوان و رەنگ بواردووم لەبەردایە
هەردووکمان وا لە ژوورێکداین
ئەو کە بە هەموو قەد و باڵامدا سەفەر دەکات و رامدەموسێت
هەرتك دەستەکانی من
کراوەن
ئەو کاتەشی کە بە دڵ و کوڵ لە رووخسارم ڕادەمینێت
یان هەموو لەشم بە چاوەکانی دەخوات
هێشتا دەستێکی وا بەسەر سێگۆشەکەی ناو لینگانمەوە
هۆ لەوێدایە و چاوەڕێ.. یان ڕاماوەو دەپرسێت
منیش تا لەمسی سەری پەنجەکانی وا دەسووتێم
هەر دوو باسکەکانیشم شل شل بە تەنکێشمدا شۆڕ دەبنەوە
من لە تەك کێدام و لە کێ دادەبڕێم؟

من ئەم ڕازانەم دەدرکێنم.. گەرچی نازانم و دڵنیا نیم
وەڵامت بە چیە و چی دەژنەویت
رەنگە بە درێژایی ژیانت بەدەم لاقرتێوە شانت هەڵتەکاندبێت
خامۆش و هێور
لە میانەی ئەو هەموو ساڵانەی راموسان و ئاوێتەبوون
چی ڕوویدا لەو شەوانەی کە دوای نانی شێوان
تۆ بێدار و گورج دەبوویتەوە
بەر لە هاتنی ئەو پەتایەی
کە تۆ و هەموو هاوڕێکانتی فڕاند و بردی

لە تەك ئەوانیشدا چی شەكەتی و قۆزی هەبوو رایماڵی.
من وا مەزەندە دەكەم كە هەرچی خامۆشییەكی ئێمە هەیە
كە وا لە مەرگدا مەلوولی كردین .. درزی برد و شكا...
خۆ لەوەدایە لەو تێبگەیت كە دەستەكانی ئەو پیاوە
منی ناچار بە چ چەشنە پرسیارێك كردبێت
ئارەزووش چەندە دوور جەستەمی برد
بەر لەوەی هۆشمەندی بەجێمبێڵێت..
بۆ تۆ چی بوو ئەو كاتەی لەمسەی پیاوێك
بەدەم سووتانەوە دەیكردیتەوە..
یان دەنێو بۆشایی و هیوایەكدا دەیخستیتە سەر ئاو و ئاگر
خۆ تۆ هیچ نەما نەیكەی تاوەكو ئەمت لە دەست نەچێت..!

پەراوێز

ئۆنەر موور ـ خانمە شاعیرێكی بەناوی ئەمریكایە و خاوەنی «رەشۆڵەیەكی سپی» یە كە تیایدا ژیانی نەنكی بابەتی سەرەكییە، دیارە نەنكی «مارگرێت سارجێنت» نیگاركێشێكی دیار بووە. شانۆنامەیەكی شیعریشی نووسیوە كە لەسەر تەختەی شانۆی «برۆدوەی» نمایش كراوە. یەكەمین دیوانی «یادگارییەكان» خەڵات كراوە. هەنووكە لە «نیۆ یۆرك» دەژی و لە زانكۆیەكی ئەو هەرێمە مامۆستایە
ئەم شاعیرە لە هەرێمە تاریكەكانی هەست و نەست و حەز و ئارەزووەكاندا گەشت بە ناو رۆحی ژن و پیاوەكاندا دەكات. لەم شیعرەو كۆی هۆنراوەكانی ناو دیوانەكەدا سۆز و نۆستالژیایەكی كوشندە هەست پێدەكرێت، لە تەك وردبوونەوە و



تێڕامان لە هەڵاتنی زەمەن و تەمەن، لە پاڵ ئاڵۆزییەکانی حەز و هەوەس و ئارەزووەکانی مرۆڤدا کە هەمیشەیی و بەردەوامە، شەهوەتێك کە تێربوون نازانێت. سێکس و حەسرەت و خەم تێکەڵ دەکات، راوەدووی مێژووی لەش دەنێت و تۆماری دەکات.. هەقایەتی مەستبوونی هەست و نەستەکان دەگێڕێتەوە. شیعرەکان خەونئامێزن و سەرباری ئەو هەموو پەچە و سەرپۆشەی کە دنەدەر و وروژێنەر و بگرە تووڕەکەرە کە شیعرەکانی پێ دەشارێتەوە، کەچی هێشتا وزە و تین و تاوێکی ئیرۆتێکی ئاگرین بانگمان دەکات، هەر هەموو هێما و هێڵەکانی ناو شیعرەکان دەروازەی نهێنین بۆ ناو رۆشنایی و درەوشانەوە. ئاخۆ شیعرن یان تابلۆن؟ وەڵامی قورسە چونکە چێژ و چەشەی شیعرەکان هەموو سنوورەکان دەبەزێنێت.. لە ناوازەیی داهێنانەکەیدا ئەم خانمە بەختەوەرە





Darling

Poems

HONOR MOORE

Grove Press

New York — 2001

# سەفەر بۆ ئێرە..!

ئیدریس عەلی

تۆ دێیتەوە و
من لیرە نەماوم
لێرە نەبوویت
من رۆشتم و
ئیتر بۆ ئەبەد هیچ کۆترێ
گمەی لێوەنەهات
بە شوێنمدا
تۆ دێیتەوە
من لێرە نەماوم
من لێرە نیم و بۆ ئەبەد
هیچ چۆلەکەیەك
بە جریوەی خۆمەوە
بانگم ناکات
هیچ ئاوێنەیەك
بە رووخساری خۆمەوە
نامبینێ
هیچ گۆڕێك

بە مردنی خۆمەوە نامگرێتە ئامێز
هیچ زستانێ
بە کڕێوەی خۆیەوە نامگرێتە بەفر..
من لێرە نەماوم و
ئیتر بۆ ئەبەد
هیچ ڕێگەیەك
دەستی وەفام ناباتەوە لای دڵی تۆ
هیچ نەسیمێ
تریفەی دیدارت ناپرژێنێ
بەسەر گوڵی سپێدەما..!
تۆ دییتەوە و دەبینی
کە ئیتر بۆ ئەبەد
باری تەنیایی خۆم پێچاوتەوە و
بۆی دەرچووم،
دێیتەوە و
دەبینی ئینجانەکان
لە شوێنی ڕاستینەی خۆیان نەماون
درەختەکان سەر و بست
سیبەریان لێبەرداوەتەوە... و
ئاوی بەلۆعەکە هەروا
خوڕە خوڕ دڵتەنگی لەبەر دەروات..!
کاتێ دییتەوە
ئیدی من... دەمێکە
وەك هەتاویکی زیز
سەری خۆم بۆ ئاوابوون هەڵگرتووە.. و



وەك مێشولەیەكی دەنگخۆش
بوومەتە حیكایەتخوانی
شارێكی دوور..!
تۆ دێیتەوە و ئیتر من
لە بازاڕی عەتر فرۆشان
لە گەڕەكی سێوڕێژان
لە حەوشەی قەرەباڵەغ و پڕ لە گوڵ
لە سەربانی چۆڵ و خاڵی لە كۆتر
لە چاخانەی قەرەباڵەغ و پڕ لە دووكەڵ
لە كۆڕی چۆڵ و خاڵی لە شیعر.. نابینی..!
دێیتەوە و دەبینیت
من لێرە نەماوم
بە دڵ و بە گیان
بە جوعبەی پڕ لە خەیاڵەوە
بە مەغزەنی پڕ لە گوڵەوە
چوومەتە ناو شەڕێكی خوێناویترەوە،
كەمین بۆ ڕێحانە دادەنێم
دانە دانە
گوڵدانەكان ئەدەمە
بەر دەسرێژی باران
میلی مۆسیقا
لە حەسحەسەكان دەهێنمەوە و
بە دەنگی بەرز
شیعریان بۆ دەخوینمەوە..!
ورتە ورت



ئەجریوێنم بە گویی
چۆلەکەیەکدا و
پێی دەڵێم:
ئەی چۆلەکەی
عاقڵ و گوێ رایەڵ
باسی ئەم سەفەرە
لای یار و ئەغیار نەدرکێنی..!
پەلە پەل
ئەگرمێنم بەسەر هەورەکانا و
بە ئاماژەی دڵ
تێیان دەگەیەنم:
ئامان هەورە هێمن و
لەسەر خۆکان
چیرۆکی ئەم رۆشتنە کتو پڕەم
بۆ هیچ باخێ نەگێڕنەوە
بە نامەیەك لە خودا داوا دەکەم:
یا سەتار و یا رەحمان
نەچی بە دەم گاڵتە و گەپەوە
لە بەینی خۆت و
ئەستێرەکانتا
لە بەینی خۆت و
بارانە بە تاوەکانتا
لە بەینی خۆت و
دارستانە چڕ و خامۆشەکانتا
لە بەینی خۆت و



حەوشە پڕ لە ئینجانەکانتا
لە بەینی خۆت و
ئێوارە سارد و بێڕەنگەکانتا
دار و نەداری نهێنی ناو دڵم
ئاشکرا کەیت..!



لەم بەشەدا هەر ژمارەو بابەتێکی ڕەخنەیی لەسەر شاعیرانی دوای ڕاپەڕین دەنووسرێت

# شیعر لە دەرەوەی هەبوون و نەبووندا

**خوێندنەوەیەک بۆ «من هەبم یا خود نا... ئەمەیە مەهزەلەکە»ی تەرزە جاف**

**ئەحمەدی مەلا**

دەسپێك :

بڕوا ناکرێ تاکو ئێستا شیعرگەلێك نووسرابێتن، هێندەی «من هەبم یا خود نا... ئەمەیە مەهزەلەکە»ی تەرزە جاف ژنانە نووسرابێتن. بۆ ئەوەی روونتریش قسان بکەین، مەبەست لە چەمکی ژنانە ئەو رەوتە فەمینیسمانە ناگرێتەوە کە سەرەرای رەوایەتی خۆیان، سەرجەم ئەو کێشە و پرسانەی کە پەیوەستن بە ژنەوە، بە شیعر تەرح کرابێتن، یا تێرمی فێمینیستانە سەرەوەری کردبێتن، یا سەرەتاکێی لەگەڵ کردبێتن، یا هەر بەلایەنی کەم نیازی شاعیرەکە بووبێت. سەرباری ئەوەی بە دەنگێکی پەنهان و هەندێجاریش بە نووکە نەقیزە دونیای پیاومان



دەخاتەوە یاد، بەڵام ئەم دەقانە مەتلەبخوازنین. واتە بانگەشەیەك نین لە پێناو وەدەستهێنانی یەکسانی و خۆهێنانەپێش بۆ ئەوەی وەکو پیاوێك سەیری بکرێت، بە قەد ئەوەی گوزارشتن، گوزارشت لە ژنایەتی خودی شاعیر دەکات. ئەم گوزارشتە رۆ دەچێتە نێو دونیایەك کە پیاوان زۆر ئاگاداری نین، تەنانەت هیچ پەیوەندییەکیشیان لە گەڵیدا نییە. لێرەوە بەهای شیعرەکانی تەرزە خۆیان بەیان دەکەن. هەروەها وەکو تۆدۆرۆفیش کە «شیعرییەتی ٢، لا. ١٨» ئاماژەی بۆ کردووە « هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی گوزارشتە لە «شتێك» و ئامانجی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، یا رەخنەی ئەدەبی گەیشتن بەو «شتە» لە رێگای کۆدە شیعرییەکانەوە.

لێرەوە دەکرێت دەقەکانی تەرزە بە «گوزارشتگەرا» لە قەڵەم بدەین. ئەو باسی خودی خۆی دەکات، بەڵام نەك وەکو خودێکی دابڕاو و تەنها بیر لە گرفتەکانی نووسین بکاتەوە. خودێکی شکست لە رێگای نووسینەوە کەلێنەکانی ژیانی پڕ بکاتەوە. بەڵکو قۆناغەکانی ژیانی ژنانەی خۆیمان بۆ دەنووسێتەوە. رەنگە ئەم دەقانە دەقی ژنانە بن بە ئیمتیاز.

ئەم لێکۆڵینەوە کورتە لە سەر چوار تەوەر ئیش لە سەر شیعرەکان دەکات : سەرەتا لە دەوری «خود» وێستێك دەکەین و بزانین چۆن لە دوو تۆی دەقدا دەردەکەوێت، چۆن گەشە دەکات، چین سەرجەم ئەو خەرمانەیەی کە لە دەوری خوددا کۆبوونەتەوە، چۆن دەردەکەون. تەوەری دووەمیش لەو پردە دەگەڕێت کە شاعیر بە دەرەوە دەبەستێتەوە، بارستاییەکانی کۆمەڵگە، تەقلید و بگرە چاودێر و رەقیبە کۆمەڵایەتییەکان چۆن بە گژ خوددا دەچن و سنوورەکانی بەرتەسك دەکەنەوە. ئاماژە بۆ ئەو بگرەوبەردانە دەکەین کە خود لە گەڵ دەرەوەی خۆی دەخاتە ململانێیەوە. بەشی سێیەمیش بۆ سەرجەم ئەو موفردانە تەرخان دەکەین کە تایبەتمەندێتی دەدەنە ئەمجۆرە نووسینە. لە کۆتاییشدا چەند ئاماژەیەك بۆ گرفتە شیعرییەکان دەخەینە روو.

١ خودبوون تا ئەوپەڕی ئێسقان؛

٢ ناکۆکی لەگەڵ دەرەوە؛
٣ دەستەواژە ناوخۆییەکان، یا حەمیمییەکان.
٤ گرفتە شیعرییەکان.
***

١ خودبوون تا ئەوپەڕی ئێسقان؛
یەکێك لە دیاردەکانی شیعری دوای راپەڕین، سەرهەڵدانی ئەو دەنگەیە کە دەیەوێت تاکایەتی خۆی بنووسێتەوە. وەکو ئەوەی هەموو شەڕەکان کۆتاییان هاتبێت و ئیدی ئینسان بیر لە خودی خۆی بکاتەوە. ( من کێم؟) ئەم پرسیارە چەندین رەهەندی هەیە، ئەگەر پرسێکی سایکلۆژی بێت بۆ ئەوەی تاك لە رێگای شیکاری دەروونییەوە ئاورێك، یا رۆچوونە ناخ بگاتە مێتۆد بۆ ئەوەی ئاقارەکانی خود بناسێت، ئەوە لە هەمان کاتیشدا بارگاوییە بە بارستاییە کۆمەڵایەتی و بگرە سیاسییەکانیش.
خود وەکو «کۆ» دێتەپێشەوە.

ئەم تێرمە دەلالاتی خۆی هەیە و رەنگیشە یەکێك بێت لە دەرهاویشتە شیعرییەکانی دوای راپەڕین. خودێکی چەپکراو دەیەوێت لە نێو کەلاوەکانی مێژوو سەردەربێنێ. تەنها لە کەشفکردنی خود بارگە و بارستاییەکانی دەرەوەمان بۆ روون دەبێتەوە. سەرجەم ئەو ئیشکالییەتانەمان لە پێش قوت دەبنەوە کە لەوەو پێش، بە شێوەیەکی کاتی، بە شێوەیەکی خێرا بە تەنیشتیاندا تێپەڕیون.
کەواتە خودبوون، خۆی لە خۆیدا دەسپێشخەری شەڕێك دەکات کە هێشتا کۆمەڵ خۆی بۆ ئامادە نەکردووە، ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانە ناوەکییەکان. «من هەبم یا خود نا...ئەمەیە مەهزەلەکە» وەکو ناونیشان جەخت لەسەر ئەم پنتە دەکات، ئەم خاڵە دەورووژێنێ، بە شێوەیەکی دیکە مەیدانی ئەم شەڕەمان بۆ یەکئالا دەکاتەوە. هەندەی دیکە شەڕەکە دژواتر دەوەستێت کاتێك خاوەنی ئەم خودە ژن بێت، بە تایبەتی لە کۆمەڵگەیەکی سوننەتی کە تاکو ئێستا یاسا مەدەنییەکان لە دابونەریت و رێساکانی مینبەرەکاندا لێکدەخشێن.
ناونیشان ئاماژەیەکی روونە بۆ یەکێك لە شانۆگەرییە هەرە بە ناوبانگەکانی شکسپیر کە لە زاری هاملێتەوە پێمان دەڵێت « هەبیت یا نەبیت، ئا ئەمەیە پرسیار» ؛ ئەم رستەیە





دوای بوحرانێکی وجوودییەوە هەڵدەقووڵێ. هاملت ئەمە دەدرکێنێ  کاتێك ئازار دەگاتە دوا سنووری و لە دونیایەکدا کە رارایی و هەژاری و گەندەڵی دەسەڵاتداران و بێ بەهایی عیشق و خۆشەویستی ئەو دونیایە داگیر دەکەن. پرسیار ئەوەیە ئەم ژیانە ئەوە دەهێنێ تیایدا بژیت یا کۆتاییهێنان بە ژیان جەوهەری کێشەکەیە. هاملیت ژیان هەڵدەبژێرێت. چونکە ئەو دیو ژیان بێ مانایە، ئەو دیو ژیان تەنها هەر هیچی تیا دەمینێتەوە، لە نێوان هیچ و ژیاندا، ژیان هەڵدەبژێرێت، سەرەڕای سەرجەم ئازار و کۆستکەوتنەکانی.

«مەهزەلە» لە ناونیشانەکەی تەرزە ئاماژەیەکیشە بۆ جیهانی نمایش، جیهانی شانۆ، جیهانێك کە تەمسیلی ژیان دەکات، نەك خودی ژیانەکەیە. مەهزەلەش بەرامبەر بە تراژیدیا دەوەستێت. مەهزەلە کۆمیدیا نییە، بەڵکو پلەیەکیش لە خوارەوە کۆمیدیایە. مەهزەلە دژ بە هەموو واتاکان دەوەستێت، جدییەتی نامێنێت، تەنانەت پێکەنینیش وەڵامی مەهزەلە ناداتەوە، بەڵکو ئینسان تووشی بزەیەکی ئەبسورد دەکات، بزەیەکە، ئەویش بە شێوەیەکی پەنهان بانگاشە بۆ لە ناوچوون و مەرگ دەکات. گرفتەکە لەوەدا نییە کە «هەبم یا نەبم» (بەڵکو بە بوون و بە نەبوون) هیچ واتایەکی بنەڕەتیمان دەسگیر نابێت، بوون وەکو نەبوون پووچە، ژیان وەکو مردن بێ مانایە! ئەمەش دەکرێت بە تراژیدیای تەرزە بخوێندرێتەوە.

چەمکی «خودبوون» کەرەسەی نەوەیەکە، ئەو نەوەیەی کە لە دوای شەڕی ئێران و عێراقەوە هەست بە کارەسات و تراژیدیا و جەنگە یەك لە دوای یەکەکان و بارستاییە ئایدیۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکان هتد سەریهەڵداوە. دوای راپەڕینیش ئەم نەوەیە چاوەڕوانی گۆڕانکارییەکی مەزن دەکات، چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە هەموو دەرگا و پەنجەرەکان بەرامبەر بە ژیان بکرێتەوە و ژیان تەواو جیاواز بێت. بەڵام ڕەورەوەی ژیان و چاوەڕوانی دوو چەمکەخوشکن پێکڕا ئیدارە ناکەن. بۆیە لە رێگای ئەم نووسینانەوە، هەست دەکرێت کە هەوڵێك لە ئارادایە بۆ ئەوەی نەخشەی خود لە نەخشەی گشتی جودابکرێتەوە.

تەرزە لە ڕێگای شیعرەوە ژیانی ژنانەی خۆی دەنووسێتەوە. کاتێك ئاوڕ دەداتەوە سی ساڵ تێپەڕیوە. هۆشیارییەك چەکەرە دەکات، هۆشیارییەکە کە هەندێجار وەکو ئەو گۆپکە وایە کە سەر لەبەیانییەك دەبینی لە لقی دارێکەوە هەڵتۆقیوە ؛ بۆیە هۆشیاری لەهەمان کاتدا بەختەوەرییە، لە هەمان کاتیشدا ئازارێکە کاتێك سەیری دەرەوە دەکەیت و بە چاوێکی دی شتەکان دەبینی، شاعیر لە پڕێکدا چاوی دەکاتەوە و هۆشیارییەکی نوێ جەستەی دەهەژێنێت : « خۆ من ئەوسا نەمدەزانی ئەو لاشە ڕەشەوە بووانە/هەموویان باوك و مێرد و کوڕ و عاشقەکانن.»

بە لایەنی کەم جەنگەکان دوو ڕەهەندیان هەیە. ڕەهەندێکیان لە ڕێگای نەخشە و حیساب بۆکردن و لێکدانەوەیەکی ساردەوە بەڕێوە دەچن، دەچێتە نێو لێکدانەوە ستراتیژی و جیۆ سیاسی و ئایدیۆلۆژییە، لەم ڕووەوە، تەنها بڕیاردەرانی جەنگەکان بەرپرسیارن، کەچی ڕەهەندی دووەمی، ئینسانییە، کۆمەڵاتییە لە خوێن و ئێسقان و هەست پێکهاتووە. ژمارە وپێوان نییە، بەڵکو لە هەناسە و دڵ لێدان دروستبووە. مەرگی ئینسانێك لە جەنگدا، لە ڕوویەکەوە ژمارەیە، لە ڕوویەکی دیکەشەوە لە ناوچوونی ڕۆحێکە، نەمانی هەستێکە، وێرابوونی خێزانێکە هتد. شاعیر ستراتیژییەتی شەڕەکان لە ڕێگای نەمان و لە ناوچوونی ڕۆحەوە دەخوێنێتەوە، نەك کێ بستێك دەچێتە پێشەوە و کێش دوو بست کشاوەتەوە!

بیبلیۆگرافیای تەرزە لە شەڕی ئێران و عێراقەوە دەست پێدەکات. کاتێك چاو دەکاتەوە شەڕە و ئیتر شەڕەکان وەکو ڕستێك، یەك بە ئەویترەوە گرێدراون. لە لۆژێکی شەڕەکاندا، شەڕ شەڕ ڕادەکێشێت. ئەو نەوەیەی لە ناو جەنگەکاندا لە دایك دەبێت، نەوەیەك هەست بە بێبەری و حیرمان دەکات، لێرەوە نووسینەوەی شیعر تەعبیرێکە لەو بێبەرییە، لە حیرمانەی کە خود وەکو کائینێکی کۆمەڵایەتی دووچاری دەبێت « نە شەر وەستا/نە حەزێکی منیش هاتە دی.»

ڕەنگە شیعر لە لای تەرزە وەکو گرفت و کێشەیەك خۆیمان پێ نەناسێنێ. بەڵکو دەیەوێ لە ڕێگای شیعرەوە







بەشێك لە ژیانی چەپێندراوی خۆی بگەڕێنێتەوە. لێرەوە نووسین، وەکو شەپۆلێك لە ئایندەوە دێت و دەیەوێ هەیکەلی ئێستامان بۆ دروست بکات.

خودێکی ژنانە لە کۆمەڵگەی کوردی، لە نێو نا-هاوسەنگی دەژێت، یا دەبێ ببیتە یاخییەکی سەرچڵ، یا ئەوەتا دەبێ بێدەنگ بیت و سواری فارگۆنە تەقلیدییەکان بیت، لێرەوە تەرزە دەیەوێت خودی داپڵۆسێنراو و چەپکراوی خۆی لە رێگای شیعرەوە بکرێتەوە. بەهای ژن لە کۆمەڵگە تەقلیدییەکەی ئێمە بە زێر دەپوێرێت، بەڵام دەرگا و پەنجەرەکانی لێدادەخرێت.  تەرزە رووی دەمی دەکاتە ژنانی وڵات و دەڵێت :» زێڕەکانت ببەوە و/ دەرگایەکم بدەرێ.» بەهای کچێکی بە شوو چوو دەبێت بەو زێڕانە بپێورێت کە ماڵی زاوا دەیدەنە بووك. بە هیچ شێوەیەك بیر لە رەهەندە کۆمەڵایەتییەکان ناکرێتەوە. زێڕ ئازادیت بۆ دابێن ناکات، بەڵکو مسۆگەرکردنێکی وەهمیت دەداتێ و بارستاییەکی کۆمەڵایەتیت پێ دەبەخشێت.

«منم ژن» هۆشیاریی و هاوارێکە. ئەم جەختکردنە، جەختکردنێکی فەمینیستانە نییە، بە قەد ئەوەی جەختکردنە لە رەگەزی خود. «هەر ئەم ئێوارەیە/شیعرێك دەنووسم/ خۆم بم.» ئەم هەوڵدانە بۆ نووسینەوەی خود، هەوڵدانێکە بۆ ئەوەی ژیان بەردەوامی وەرگرێت.

کێشەی خودبوون لە دەوروبەرێکدا پێناسەکراوە کە خودی ژیان بۆ کاتێکی دیکە دواخراوە، کێشەیەکی بنەڕەتییە. گۆڕانکارییە دەرەکییەکان هیچ لە کێشەکانی خود ناگۆڕن، بە پێچەوانەوە گەورەترین وەرچەرخان لە مێژووی کوردا، «راپەڕینە» بەڵام دەبێ زۆر بە وردی ئەم وەرچەرخانە بخوێندرێتەوە، چونکە ئەم رابوونە هیچ لە هاوکێشە بنەڕەتییەکە ناگۆڕێت و کێشە وگرفتەکانی کە پەیوەستن بە ژیانی ژن و کچانەوە وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

«هەموو سەرسوڕمانەکانم هەڵگرت و
لە چاوتروکانێکدا بوومە سی ساڵ.»

چونکە هاوکێشەی نیوان تاك و کۆ، خود و کۆمەڵ، زات و کۆمەڵگە، هەروا

به ئاسانی ناچێته نێو پێناسەیەکی ترەوە. سەرەڕای ئەو گۆڕانکارییە دەرەکییانە، تاکی شاعیر، ژنی شاعیر، خودێکی ژنانە هۆشیاریی لە لای هەندەی دیکە ئازاری دەدا، هۆشیارییەکە هەندەی دیکە دیوارەکانی زیندانی کۆمەڵایەتی بەرزتر دەکات، هەندە بەربەستەکان دژوارتر دەبن :

«فریشتەیەکی لە بەهەشت دەرکراو
هێشتا خوێنی خەڵقبوونم لێدەچۆڕێ
بیر لە چوار دیوار دەکەمەوە
خۆمی تیا بکوژم»

سەبارەت بە گەشەسەندنی خودی شاعیر، لە هەرەتی کچێتییەوە کە ئارەزووی ئەوەی هەیە بژێت و بەس، بۆ بە شاعیربوونی و خۆفەرزکردنی وەکو ژن، دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی هۆشیارییەکی نوێ کە ئازاری دەدا و لە هەمان کاتیشدا دەبێتە پاڵپێوەنەرێکی راستەقینەشە لە پێناو مومارەسەکردنێکی ژیانێکی راستەقینە. ژنێکی سەربەست و گوزارشتکردن لەو سەربەستییە. خود پرسیار دەکات، تووشی حەپەسان دێت و دوور دەڕوانی و ئاوڕ لە چیرۆکی ئادەم دەداتەوە و خۆی لە نێو هەمان تەوندا دەبینێ.

٢ ناکۆکی لەگەڵ دەرەوە؛
لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، دەرەوە یەك شت نییە، واقیعی دەرەوە یەك پێناسە هەڵناگرێ، دەرەوە بۆ ژن هەمان دەرەوە نییە بۆ پیاو. ئەگەر بەردەرگا بۆ ژنان وەکو دەرەوە حیسابی بۆ بکرێت، ئەوە بۆ پیاوان سنوورێکی دیاریکراوی نییە. بۆیە سەرجەم ئەو ناکۆکییانەی کە ژنان لە لای ئێمە لە گەڵ کۆمەڵ بەرەو رووی دەبێتەوە، ئاڵۆزتر و دژوارتر و بگرە شەڕانی ترە. دەرەوە دەبێتە چەندین توێژی سانسۆر و رەقیب، هەر لایە و بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی ئەم چاودێرییە ئەنجام دەدات، بەکاری دەهێنێ و تەوزیفی دەکات. لە کێشە ئاڵۆزەکانی شەرەف و ناموسەوە، بۆ سومعە و ناوزڕان هتد. ژن لەو کۆمەڵگایە هەمیشە لە ژێر تەلسکۆبێکی کۆمەڵایەتی، ئاینی، پیاوسالاری دایە.
پراکتیزەکردنی ئازادی خێرا دەبێتە تەوقێکی کۆمەڵایەتی و دەبێ باجەکەی بدرێت. ئازادی ژن، لەو کۆمەڵگایانە واتە ملکەچی پیاو و





سەرشۆڕی پیاو.
خود و کۆمەڵ لە شەڕدان، وچان دەدەن، ئاشتدەبنەوە و شەڕدەکەنەوە. ڕەنگە چەمکی کۆمەڵ، یا هێزی کۆمەڵایەتی لە شیعرەکانی تەرزەدا لە وێنەی «دایک»دا بەرجەستە بووبێت. دایك لە دیدی تەرزەدا، هەڵگری ئیشکالییەتە، ئەم ئیشکالییەتە لە هەمان کاتدا ڕێگرە، لە هەمان کاتیشدا هاندەرە. ڕەنگە بزوێنەری هاندان سەرجەم ئەو بەربەستانە بن کە دەبنە ڕێگر و کۆسپ لە بەردەم هەڵکشاندا، لەبەردەم گەشەسەندندا، بە کورتی لەبەردەم ژیاندا.
دەرەوەی تەزرە، بە شەڕ تەنراوە، شەڕەکان لە گەڵ تەمەنی ئەودا فراوان دەبن تا دەگەنە شەڕی ناوخۆ کە ئیتر شەڕ دەچێتە نیو بوونییەوە. ئەمەش چ لە رووی دەروونییەوە، چ لە رووی کۆمەڵایەتییەوە کاریگەرییەکی هەتاهەتایی لە لای شاعیر دروست دەکات. هەروەها چاودێری دەرەوە، لە دایکدا بەرجەستە دەبێت، ڕەنگە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، بە تایبەت بۆ کچان، دایك ئەڵقەی چاودێری بێت لە نێوان دەرەوە و ناوەوە. ئەم دووفاقەییە کە تەرزە لە شیعرەکانی بەرجەستەی کردووە :» دایکم فریشتەیەکی سەرگەردان.» بە جوانی ئاماژە بۆ ئەم دوو فاقییە دەکات. بەرامبەر بەم وێنەیە، وێنەیەکی دی بە زەینماندا تێدەپەڕێت، وێنەیەکی باو، تەنانەت وێنەیەکی سواو « دایکم فریشتەیەکی میهرەبان»، کەچی شاعیر ئەمەمان پێ ناڵێت، چونکە هاوکێشەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە بە وێنەیەکی منداڵانە، وێنەیەکی ساوێلکە کۆتایی بە کێشەکە بهێنرێت.
شاعیر باسی خۆشەویستی دایکانە دەکات، بەڵام بەدەر نییە لە توندوتیژیی، بەڵام توندوتیژییەکی پەنهانە، لە پلەی دووەم، بگرە سێیەمدا خۆی گرمۆڵە داوە. تەرزە دەڵێت: «دایکم ئەوەندە منی خۆشدەویست/لەگەڵ یەکەم نەرمە لەرزەی کچێنیدا..» وەکو ئەوەی دایك سەعات بە سەعات تەمەنی کچی خۆی بژمێرێت، نەك لەبەر ئەوەی خۆشیدەوێ، بەڵکو دەیەوێ بزانێت کە کچ دەچێتە نێو تەونی کۆمەڵایەتییەوە بۆ ئەوەی هەموو کامێراکانی چاودێری لە دەوری ماڵدا،

به ئاسپایی هەڵواسێت!
کچێنی، ئاماژەیەکە بۆ باڵقبوون، ڕەنگە هیچ کارەساتێك لەوە ئازاراویتر نەبێت کە کیژۆڵە لە کۆمەڵگەی ئێمە دەچێتە هەرەتی کچێنی. ئەم وەرچەرخانە، تەنها بە کات ناپێورێت، تەنها پەیوەندی بە ساڵ و مانگ و ڕۆژەوە نییە، بەڵکو دەروونی و کۆمەڵایەتییە. واتە کۆمەڵگە دەیەوێت دیقەتی ئەم باڵقبوونە بدات. ئیتر پەیوەندی بە تاکەوە نامێنێت و دەبێتە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، کێشەی گەورەکان. لەم وێنەیەی لای خوارەوە ئەم باڵقبوون و دەچێتە نێو زاکیرە و عەقڵییەتێکی باوکسالاری هەند بە هەژموون کە ئیدی خود هیچ بایەخێکی نامێنێ، زات دەکەوێتە ژێر ڕکێفی کۆمەڵگاوە :»
ئەوەندە دەترسا لە سەرم دایکم/ هەر زوو منی تێگەیاند/ کە سەربڕینی من/ لە سەربڕینی ئەو بەرخە ئاسانترە.»

لێرە سەرجەم ئاماژەکانی قوربانی کۆدەبنەوە. ئەوەی هەنووکەیی دەبەخشێتە ئەم سێ دێرە شیعرییەیە، ئامرازی «ئەو»ە کە حاڵەتی هەبوونی، وجوودی دەبەخشێتە کەرەسەی ئاماژەپێکراو کە لێرە هەڵبەتە «بەرخە»، هەندەی دیکە وێنەکە دەبێتە دژە ژیانێك و لە تەنیشتماندایە. ئەم زمان لە ڕەمزییەتەوە دەگوازێتەوە بۆ بوونی ئێستایی. کاتێك دەترێت «بەرخ» زۆر لەوە جیاوازترە کە بوترێت «ئەو بەرخە». یەکەمیان دەچێتە بواری فەرهەنگەوە، دەچێتە بواری زمانی تەجریدەوە هەروەکو سۆسور ئاماژەی بۆ کردەوە، کەچی دووەمیان دەچێتە بواری قسەکردنەوە، واتە گوازتنەوەی زمان لە تەجریدەوە بۆ ژیانی ڕۆژانە. گواستنەوەی ڕەمزە بۆ نێو ژیان.
ئاماژەکانی  قوربانی و بەرخ ئیمکانی نییە بیرمان بۆ خوێن ڕانەکێشێت. دواتر دێینە سەر چەمکی خوێن لە  شیعرەکانی تەرزە.
با بێینەوە سەر چەمکی دایك وەك ڕەقیبێکی کۆمەڵایەتی دووفاقە. شیعرییەت تەنها لە نێو دووفاقەیی لە دایکدەبێت. واتە گۆڕانییەکە لە نێوان هەتاو و سێبەردا، لە نێوان ڕووناکی و تاریکی، لە نێوان تەجرید و هەستیارییدا. دایك دووفاقەیە لە نێوان جەبری کۆمەڵایەتی و خۆشەویستی خێزاندا. لەم وێنەیەی خوارەوە ئەم ڕەقیبە دەگاتە ئاستی







ڕەقیبێکی کۆمەڵایەتی بە ئیمتیاز، وەك بڵێی تەنها ئیعازەکانی لەدەرەوەوە پێبگات :»
ئەوەندە خۆشیدەوەیستم دایکم/ نەیهێشت هیچ هەناسەیەکم لە حەوشیماڵەکەمان دوورتر بڕوات.»

لێرە فرمانی «نەهێشتن» لە ڕابردووی کۆتایی پێهێنراو دروست بووە، نەك لە ڕابردووی بەردەوامی «نەیدەهێشت»، چونکە لە پشت فرمانی یەکەمدا، هێزێکی جەبەرووتی هەیە، کۆتایی پێهێنراو، بڕاوە، کەچی لە دووەمدا هەناسەیەك، دەرچەیەك، هەوڵێك لە ئارادایە. کاتێك دەوترێت «نەیدەهێشت» ئاماژە بۆ هەوڵە یەك لە دوای یەکەکان دەکرێت، واتە هەموو جارێك ویستبێتم سەر بکەمەوە دەرەوە «دایکم نەیهێشتووە»، لێرەدا هەست بە ژیان دەکرێت، بەڵام کاتێك دەوترێ «دایکم نەیهێشت بچمە دەرەوە.» وەك ئەوەی ژیان ساتەوەختێك بێت و فرمانێکی تێدا درابێت و بڕابێتەوە و کردەوەیەکی تیا قەدەغە کراو و کۆتایی پێهاتووبێت. ئەم وێنە شیعرییە دەمانگەیەنێتە ئاستێك کە هەست دەکەین کە ئیتر ژیان تووشی وەستان هاتووە، دەرگا و پەنجەرە و دەرچەکان نەماون.

ئەم چاودێرە کۆمەڵایەتییە، دەبێتە بارستاییەك، تەنانەت وەکو کابووسێکی لێدێت، ئینسان تووشی دڵەراوکێ دەکات، هەستی ئەوەت تیا دەبووژێنێتەوە کە لە پشتەوەت دوو چاو هەمیشە بە دواتەوەیە، ڕەقیبێك دەچێتە ناختەوە، ئیتر لەوەێوە سەیرت دەکات، چاودێریت دەکات. وەك بڵێی ئەو گەرایەی کە کۆمەڵگا لە ناوەوەت دایدەنێ، دەترووکێ و گەشەدەکات و هەراش دەبێت.

لێرەوە چەمکی «سانسۆری زاتی» هەموو واتاکانی دەسگیر دەبێت : «
چاوەکانی دایکم دەبینم بە دوامدا دەگەڕێن.»

بەڵام کارەساتی گەورە لەوەدا نییە کە ئەو چاودێرە کۆمەڵایەتییە ئیتر لە دەرەوە نییە و لە ناخدا جێگیرە، بەڵکو ڕێگرە لە هەراشبوون، لە پەروەردەکردنی خودێکی هۆشیار و لێپرسراو و ئۆتۆنۆم. بە شێویەکی دیکە، پەتی نێوان دایك و باوکان و منداڵ، تووشی پچڕان نایەت، ئەمەش بەرهەمهێنەری خۆشەویستییەکی لەرزۆکە، سادەیە، تەنانەت

بێ قووڵایی و بێ ئەستوورایی
و بێ ڕەگ ریشەیە؛ هەندە
نووزانەوەیە، هەندە خۆشەویستی
نییە، هەندەی پێداویستییە، هەندەی
خۆشەویستییەکی ڕەها نییە. بۆیە،
بە نەمانی دایکوباوك، ئیدی هەموو
بەرجەستەکان قووت دەبنەوە،
تەنانەت دەرگا لە ڕووی تراژیدیا
دەکرێتەوە :» دایکم لە دەستدا و
ڕێگەی ماڵەوەم بزرکرد.»
ڕەنگە لێرە ناهۆشیاریی کۆتایی بەم
بەشە گرینگە بهێنێت. دایك-کۆمەڵ
دەیەوێت کچ لە نێو چواردیوادا
بمێنێتەوە، ژیان دەبێتە نامووس
و نامووسیش دەبێتە زیندانییەك،
بەڵام تەرزە، دوای مەرگی دایکی
لە دەرەوەیە، چ دەرەوەیەك؟ جۆرە
دەرەوەیەکە کە ڕێگاکانی ماڵی
بزر کردووە!!! ماڵ وەکو چەمکی
بەختەوەری لە لای گاستۆن
باشلار،

ئاوسە بە ڕەگەزەکانی ژیان، گەرما، ئاسوودەیی، سۆز
هتد کەچی شاعیر دوای ئەو پەروەردە ملهوڕەی کۆمەڵ،
هیچ ئەنجامێکی ئۆخژنی لێوە دەسگیر نابێت. بۆیە
بە شێنەیی پێمان دەڵێت :» هەڵەکانی دایکم دووبارە
ناکەمەوە.»

ڕەنگە ئەمە وانەیەکی زۆر گرینگیش بێت لە بواری
پەروەردە، کەچی ئامانجی ئەم شیعرانە پێداگۆژی و
پەروەردەیی نین. ئەم پشتەوەی دەقە و دێتە قسە!
بۆ کۆتاییهێنان بەم بەشە، با پێکەوە ئاوڕێك لە خوێن
بدەینەوە کە لە سەرەوە ئاماژەیەکی خێرامان بۆی کرد.
سەرەتا، لە عەقڵییەتی کوردەواریدا، خوێن جێگایەکی
زۆر لەبەرچاو داگیر دەکات، جۆرە تێکەڵییەکە لە
نێوان بیروباوەڕە ئاینیی و خۆماڵیی و ڕەهەندە
خێڵەکییەکان کە خوێن و خزمایەتی یەکێکە لە
کۆڵەگە هەرە پتەوەکانی. سەرەڕای ئەوە خوێن لە
ڕەمزییەتی گەردوونیدا، ئاماژە بۆ ژیان دەکات، هەر
وەکو فەرهەنگی سەمبۆلەکان ئاماژەی بۆ دەکەن و
لە ئینجیلدا هاتووە کە خوێن وەکو ژیان
سەیرکراوە. هەروەها بە پێی تەقلیدە
کلدانییەکانیش، خوداوەند خوێنی
خۆی ڕۆ دەکات بۆ ئەوەی لە سەر
ئەزر بوونەوەرەکان سەرهەڵدەن.
(فەرهەنگی سەمبۆلەکان، ژان شڤالییە
و ئەلان گێربران، ل٨٤٣) هەروەها لە





ئەفسانەگەلێکیشدا، هەر خوێنە ژیان دەبەخشێتە روەك و ئاژەڵان. لە لای هەندێك لە میللەتانیشدا، خوێن رەورەوی رۆحە. تەنانەت لە زمانی عەرەبیشدا خوێن و رۆح ئاماژە بۆ یەك شت دەکەن. رشتنی خوێنی ئاژەڵان پێش ئەوەی گۆشتەکەی حەڵاڵ بکرێت، ئاماژەیەکە بۆ دەرهێنانی رۆح.

هەروەها لە عەقڵییەتی خۆماڵی کوردیدا، خوێن شتێکی پیسە، تەنانەت قێزەوەنە، ئەمە تەواو بە پێچەوانەی ئەوە دەوەستێت کە خوێن سەرچاوەی ژیان بێت. «پەرۆی بێنوێژ» ئاماژەیەکی دیکەیە، بۆ خوێنی مانگانەی کچان و ژنان. لێرەوە چەمکی ئاینی تێکەڵی دەبێت، عادەی مانگانە، ژن لە پلەیەك دەهێنێتە خوارەوە، دەیکاتە کائینێکی پیس. هەروەها رژتنی خوێنی قوربانی و جەژنی قوربانیش یەکێکە لە ئاماژەکانی. «بۆنی قەیسی لە خوێنت دێ.» ئەم تێکەڵکردنە شیعرییە، ئاماژەیەك بۆ تێکەڵبوونی سنوورەکانی خۆشی و ناخۆشی، تامی شیرینی قەیسی و تاڵی خوێنڕشتن. جەژن کەشێکی بێلایەن نییە، قوربانییەك بێگوناه هەیە و خۆشییەکی لە پاڵدایە. شیعر تەنها لەو سنوورانە لە دایك دەبێت کاتێك ناوهێنانی شتەکان سەخت دەکەوێتەوە. خوێن لە کۆزاکیرەی ئێمە شوێنێکی فراوان داگیر دەکات. ئەم کۆبەکارهێنانە لە ژێر خامەی تەرزە دەخوێنینەوە. خوێن یەك واتای نییە، خاوەن تاقە رەهەندێك نییە، بەڵکو پانتایی لاپەڕەکان داگیر دەکات. لە پاڵ بەکارهێنانی خوێن وەکو قوربانییەکی ئاسایی کە لە حەکایەتی برایم و سمایلەوە دەگاتە لامان، دەچێتە کەشوهەوایەکی ئاینی تایبەتەوە : « کە دوو جەژن جارێك لە ماڵی ئێمە بێ گوناه خوێنیان دەڕژا.» دەبێ هەڵوێستەیەك بەرامبەر «خوێنی بێ گوناه»بکەین. بەرامبەر ئەم چەمکە «خوێنی تاوانبار» بە زەینماندا دێت. بە واتایەکی دی، رشتنی خوێنی بێگوناهێك و رشتنی خوێنی گوناهبارێك، ئەگەر یەکەمیان تاوانێك بێت، دیارە دووەمیان ئاساییە! هەروەها خوێن دەچێتە نێو مەیدانی شەڕە ناوخۆییەکانیش، کاتێك برا بە دەستی برای خۆی خوێنی دەڕژێنرێت، جگە لەوەی ئاماژەیەکە بۆ چیرۆکی خەڵق، کاتێك هابیل بە دەستی قابیل دەکوژرێت:»

گۆشاوگۆشی براکانم لە خوێن وەردەدەن»،
«هێشتا خوێنی خەلقبوونم لێدەچۆڕێ» ؛
هەروەها ئاماژەیەکیشە بۆ بەتاڵکردنی حیزبە سیاسییەکان لە واتاکانی خۆیان. «شیعارە درۆزنەکان خەڵتانی خوێن دەبن.»
خوێنێك هەیە شیکلی دەرەکی هەیە، ئەنجامی دووبەرەکی و شەڕو پێکدادانەکانی دەرەوەیە :» لە هەموو لایەك فیچقەی خوێن دێ.» ئەم خوێنە لە رەهەندە سیاسی و شۆڕشگێریی و شەڕەکانی ناوخۆدا خۆیمان بۆ بەیان دەکات. هەروەها «خوێن» تێکەڵ بە بۆنکرووزی سووتانی ئەو گۆشتانە دەبێ/کە کوڕەکان دەیانپرژاند.»
لێرەوە ئیتر شۆڕ دەبینەوە بۆ واتاگەلێکی حەمیمی، ناوەکی، تایبەت بە خوێن. ژن ئەو پانتاییەیە، ئارەزووە سوور رەنگەکان، لە پاڵ رەنگی خوێن خۆی ئاشکرا دەکات. شاعیر شاعیرانە دەیەوێ باسی ئارەزووی «ئۆرجازم»ممان بۆ بکات، تەنانەت موورادیفەکەی بە زمانی کوردی

جگە لە پاڵ «رەحەتبوون» شتێکی دیکەمان دەسناکەوێت، ئەوەی راستیش بێت، زمانی کوردی لەو بوارە کۆڵەوارە، چونکە چەپاندنی کۆمەڵایەتی لەلایەك، نەبوونی زانیارییەکی پێویست لەو رووەوە لە لایەکی دی، زەلیلی پەروەردە هەموو ئەم فاکتەرانە بەشدارن لەوەی کە زمان ئازادانە بە دوای موفرەدەی خۆی نەگەڕێت، هێز و وزەکان نەتوانن لە ناو رەحمی زمانەوە ئەو موفرەدگەلانە بئافرێنن. « چی بێت مرۆڤایەتی و ژنایەتی جودا بکاتەوە و/سنووری ئۆرجازم و فیچقەی خوێن بکاتە یەك/لە کچێك زیاتر هیچی تر نەبوو.»
لێرە رستەیەکی ژۆرژ ساندم دێتەوە یاد دەڵێ « خودا خۆشی و ناخۆشی هەند لە تەنیشت یەکداناون، کە هەندێجار ئینسان لە خۆشیدا دەگریێ.»
ئەم دووفاقییە جارێکی دی دەبووژێتەوە، ئەمجارەیان لە نێوان مرۆڤایەتی و ژنایەتی، لە نێوان ئۆرجازم و خوێن. ئاماژەیەکی بێ پەردەیە بۆ ئەفسانەکانی پەردەی کچێنی کە شۆڕ دەبێتەوە بۆ نێو مێژووی نێرسالاری، تەنانەت دەستەواژەی «ژنهێنان» و «ژنگواستنەوە» دەرهاویشتەیەکی بەڵگە نەویستی ئەم عەقڵییەتەن. وەکو



دەسەڵاتی نەبزێوی پیاوان بێ بەڵگە بن، ژن دەبێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، وەکو کاڵا و شتومەك بگوازرێتەوە، وەکو هەموو کاڵاو شتومەکێکیش، ژنی گواستراوە دەبێ «نوێ» بێت، «دەستلێنەدراو»بێت، بە کوردی و کورتی «سەرمۆر»بێت، ئەگینا موڵکی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی. ئەم پرسیارگەلە بە هێچ شێوەیەك پیاو ناگرێتەوە، ئەوێك وەکو چەق، وەکو سەنتەر، خۆی نیشان دەدات، ئەوی ژنیش دەبێت لە فولکەی ئەودا بخولێتەوە.
لێرە «خوێن» تەنها قسە ناکات، بەڵکو هاوار دەکات، بە دەنگێکی بەرز ئەوە رەت دەکاتەوە کە «خوێن» لە پاڵ «ئارەزوو» دابنرێت، «خوێن» هاوتەریب لەگەڵ خۆشیدا بخوێندرێتەوە.
هەموو ژنگواستنەوەیەك لەو کۆمەڵگە تەقلیدییانە، لێکدانی ئەم دوو جەمسەرە دژ بەیەکەیە. تەنانەت «کچ» لە جیاتی خوێن لە خێزانێکەوە بۆ خێزانێکی دی، لە خێڵێکەوە بۆ خێڵێکی دی، یەکێکە لە دەرکەوتە تراژیدئامێزانەیە کە کچ لە ئینسانییەتی خۆی دائەماڵرێت و لە جیاتی خوێن، واتە دەبێ تا ماوە سەرشۆڕ لە ماڵی مێردەکەی ژیان بباتە سەر. لێرەوە ئەم دژوارییە لەو دێڕە شیعرە خۆیمان بۆ روون دەکاتەوە.
ئەم لێکدانی دوو جەمسەرە، لە شوێنێکی دیکەش بە ژێر خامەی شاعیردا تێدەپەڕێ :» دیژلەمەی خوێنم هەڵقوڕێنێ.» دیسانەوە سەرجەم کۆواتاکانی شیرینی، خۆشی، شتە مەحسووساتەکان لە پاڵ خوێن جارێکی دی رادەوەستێ.





٣ دەستەواژە ناوەکییەکان، یا حەمیمییەکان.
لە سەرەتای ئەم رەخنەیە ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کە شیعری تەرزە ژنانەترین شیعری کوردین، بە بێ ئەوەی ئیدیعای فەمینیسمی کردبێت، بە بێ ئەوەی ئایدیۆلۆژیانە ئەم چەمکە ترنجابێتە نێو دەقەکانی، بە بێ ئەوەی شیعربن بۆ هۆشیارکردنەوەی ژن سەبارەت بە کێشە و پرسەکان

بەکاربهێنرابێت، ئەو دەیەوێ لە ڕێگای
شیعرەکانییەوە ژنانە مومارەسی ژیانی خۆی
بکات. ئەو دێت ڕۆ دەچێتە نێو ئەو ژیانە،
مەبەست لە ژیانی خودی ژنانە.
کاتێك ئەم دەقانە دەخوێنینەوە، هەست
دەکەین لە هەموو کونوکەلەبەرێکدا ژیانێك
هەیە، وەك بڵێی جامێك پڕبووبێت لە ژیان،
لێواولێوی ژیان بووبێت. بێگومان ئەمە
مانای ئەوە نییە کە واقیع دژوار نەبێت،
ترس و دڵەراوکێ خودی ئەم ژیانەی
نەتەنیبێت، بەڵام چەندین موفرەدە هەن
کە تایبەتبەتمەندێتی دەدەنە ئەم شیعرە و
لە شیعری ژنانی دیکە جودای دەکەنەوە.
یەکێك لە خاڵە هەرە جەوهەرییەکان
ئەوەیە کە شیعری خۆشەویستی «پیاوانە»
لە ناوەڕۆکی خۆی بەتاڵ دەکات، سنوور
بۆ سەرجەم ئەو شیعرانە دادەنێت
کە ئاراستەی ژن کراون ؛ سەرلەنوێ
هاوکێشەی ڕۆمانسییەتێکی ڕەنگزەرد و
ڕەنگپەڕیو تووشی ڕاچەنین
دەکەن.

هەندەی شیعری پیاوان کە سەبارەت بە
خۆشەویستی نووسرابێت کە باس لە فیراق و
کرووزانەوە و لاڵانەوەیەکی دەروێشانە دەکەن
لە ناوەڕۆکەکانی بەتاڵ دەکاتەوە. شیعری پیاوان
کە بۆ ژن نووسرابێتن دەهێنێتە پلەی سفری
نووسین. شیعری تەرزە بانگاشەیەکی شەهوانییە
بۆ ژیان، شیعری ئاوێتەبوون و ئاوێزانە بە
پێچەوانەی ئەو جۆرە شیعرانەی کە خۆشەویستی
ژن وەکو پاساوێك، تەنانەت وەکو بێبەریبوونێك
و حیرمانێکی دەروونی وکۆمەڵایەتی خۆیمانی
پێ ناساندووە کە زۆربەی هەرە زۆر ڕەگەز و
توخمی ئەو شیعرانە لە چاخەکانی ناوەندەوە
گەیشتوونەتە لای ئێمە. شیعرەکانی تەرزە بۆ
پیاهەڵدانی پیاوان نییە، بۆ ئەوە نییە بگاتە
پیاوان، بەڵکو ئەو دەیەوێت بژێت.
ئەم حەمیمییەتە لە ناو جەرگەی ژیاندا، لە
وردەکارییەکانی ڕۆژگاردا ڕوودەدات. دەیان
موفرەدە هەن پاساو بۆ ئەم گریمانەی
ئێمە دەهێننەوە. « پێڵاوی بنبەرز» و
«حیتەحیت» و «ماکسی» و «مەکر»
و «پانتۆڵی کەتان» و «مورووو» و
«شیلەی لوقمە قازی» و « زاکیرەی
ماچ» ئاماژەن بۆ ئەو ژیانە ناسکە،
ئەو واقیعەی کە لە سەر تەنافێکی
باریکدا دەیەوێت هاوسەنگی خۆی







لە دەست نەدات. ژیان لە شیعری تەرزە ناسکە وەکو کریستال، زوو دەشکێت، زوو دەتوێتەوە و لەو ئاوهەوایەدا تەنها زاکیرەیەك دەمینێ کە بانگاشە بۆ نوستالژییەك دەکات. ژیان لە پشتەوە، چاوشارکێمان لەگەڵ دەکات.
وردەکارەکانی ژیان :» حەوت قاپ و حەوت کەوچك و حەوت پەرداغ» لە ناکاوێکدا ژمارەکان تووشی جێگۆڕکێ دەبن ؛ لە سەر سفرەیەك یەکێك نوقسان بێت، هاوسەنگی گەردوون تێکدەچێت! «تراشێك دەکەی»، « سمێڵ»، «تێشێرت»، «ئەلبوم» رەنگە هەندەی باس لەعیشقەوە بکات، عیشق دەکات، خۆشەویستی مومارەسەیەکی رۆژانەیە، گوتارێکی ئەقلانی و بانگەوازێك نییە.

٤ گرفتە شیعرییەکان
سەرەتا ئاماژە بۆ ئەوە کرا خەسڵەتی ئەم شیعرانە « گوزارشتگەرایییە» واتە دەیەوێ ببێتە پردێك رایەڵەکانی نێوان شاعیر و دەرەوە پێك گرێدات. ئەمجۆرە دەقە سەرەڕای سەرجەم ئەو خاڵانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆیان کرد، دەقێك نییە بیر لە بونیادی دەق بکاتەوە، بونیادێکی نییە ئاوڕێ لە چۆنیەتی پێکهاتن و پێکهاتەکانی خۆی دابێتەوە و دیققەتی ئەوەی دابێت چۆن لە دایکدەبێت.
رەنگە دەستەواژەی «پرد» پڕ بە پێستی ئەمجۆرە نووسینە بێت، لە لایەن شاعیر باسی کچبوون و ژنبوونی خۆی دەکات ولە لایەکی دیکەش دەیەوێ بەربەستە کۆمەڵایەتییەکان تێکبشکێنێ و دەق بگاتە منی خوێنەر، یا ئەوی بیسەر، بەڵام بیر لە خۆی ناکاتەوە وەکو دەق.
کاتێك دەوترێت «پرد» واتە خاڵی پێکگەیشتن، بەڵام لە خودی خاڵی پێکگەیشتنیش، خاڵی جودا بوونەوە هەیە، ئەمە خەسڵەتی پردە، بە واتایەکی دی دەیەوێ پشت لە تەقلیدە شیعرییەکانی پێش خۆی بکات، واتە دەنگی شەست و حەفتاکان لە دووی خۆی جێبهێڵێت، ئەگەر ئەم جێهێشتە راستیش بێت، بەڵام هەڵگری خەسڵەتە گوزارشتگەرایییەکانە و جێگۆڕکێی بە تێمە و بابەتەکان کردووە. ئەو خاڵانەش کە شیعری

تەرزە ئاودیوی دوای راپەڕین دەکات و ئایندە دەنووسێتەوە، ئەوە ئەو جیهانە حەمیمی و تایبەتەیە کە شاعیر مومارەسەی دەکات.
بەڵام دەقی تەرزە دەقگەلێك نین کێشەکانی «نووسین»ی کردبێتە بابەت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە بابەتێك. کاتێك ئەم خاڵە دەورووژێنین باس لە سەرجەم ئەو رەگەزانە دەکەین لە شیعرییەتی دەق لە خۆ دەگرێت : رەهەندە زمانەوانییەکان، بارستاییەکانی وشە، هاوئاوازیی نێوان پێکهاتە زمانەوانییەکان، تەنانەت دڵەڕاوکێی خودی زمان بەرامبەر بە خۆی.
شاعیر کائینێکە لە زمان و شیعریش دڵەراوکێیەکانی زمان تۆمار دەکات. رەنگدانەوەی ئەم دڵەراوکێیانە، ئەو سنوورانەی کە گەیشتن پێی مەحالە لە شیعری تەرزە رەنگی نەداوەتەوە. پێدەچێ شاعیر بە بی سڵەمینەوە گوزارشت لەم سەفەرە شیعرییەی بکات. تەنانەت رەنگە شیعر بێتە گشت خودی نووسەرکەی؛ پڕ بە دەم دەیەوێ ئەوەمان پێ بڵێ کە»
ژنایەتیم شیعر دەیکوژێت.» وەکو ئەوەی شیعر خاوەن رەگەز بێت، هی پیاوان بێت و بە نووسینەوەی ئیدی ژنایەتی لەناو بباتـ. ئەم پنتە ئیشکالییەتێکی دروستکردووە، لە لایەن ژنانە دەدوێ، لە لایەکی دی کردەی نووسینی شیعر دژ بە ئەم ژنانەیە بوەستێت.
بۆیە لە ناواخنی کەسایەتی نووسەر هەست دەکات کە شیعرنووسین دوا شەڕە، تەنانەت شەڕی ئەو کەسانەیە کە بێ چەکن، بێ دەسەڵاتن، بە بێ ئەوەی لە ئاستی رووداوەکانی دەرەوە بن :» دیسانەوە شیعر/ زمانی لاوازیی و دەستەوەسانی.» نەخێر ناکرێ جارێکی دی بگەڕێینەوە ئەو خاڵەی کە شیعر وەکو چەکێك دەبینن، یا وەکو ئامرازێك بۆ بەرەورووبوونەوە، یاخود ئامادەکردن بۆ چوونە نێو مەیدانەکانی بەرەنگاربوونەوە و پێکدادانەکان. شیعر زمانی بێدەسەڵاتان نییە و هەروەها زمانی دەسەڵاتدارانیش نییە. تەنها وجوودی شیعر بەسە، تەنانەت ئەم بەسییە زۆر بەسە.
«تەنها شیعرم پێ ماوە.» ئەم هەستە قووڵە! گوزارشت لە شەڕێکی دۆڕاو دەکات، چونکە شیعر ناتوانێت دونیا بگۆڕێت، ناتوانێت



تەنانەت خودی شاعیریش بگۆڕێت.

شیعری دوای ڕاپەڕین، موچڕکێکی زۆر تەندروستە. منێکی شاعیرانە دێتە سەر سەکۆی وجوود، وەهمی گەورەی پێیە و ڕادەمێنێ لە «من»ێکی مەزن، بەرامبەر بە جیهانێك هەست دەکات بۆ ئەو دروست نەکراوە، هەست دەکات «من»ێکە لە خۆی زیادە، جێگای لە نێو ئەو گۆڕانکارییانە نابێتەوە. لێرەوە هەست بە ڕۆمانسییەتێکی نوێ لە دەقەکانی دوای ڕاپەڕین دەکرێ.

بۆ کۆتایهێنان بەم چەند لاپەڕەیە، دەتوانین وەکو ئەنجام ئەم خاڵبەندییە بۆ شیعرەکانی «من هەم یا خود نا...ئەمەیە مەهزەلەکە» پێشنیار بکەین :

– شیعر وەکو بیبلۆگرافیا تەمەنی شاعیر دەنووسێتەوە ؛

–خود پرسیارێکە، لە بگرەوبەردەیەکی بێوێنە لە گەڵ دەرەوەی خۆی دەژێت کە وێنەی دایك بەرجەستەی کردووە ؛

– خۆشی و ناخۆشی دوو دەستەخوشکن پێکەوە نەبێت هەڵناکەن، خوێن یەکێکە لە دەرهاویشتەکان ؛

– موفردە ناوەکییەکان ئاماژەیەکی وردن بۆ ژیان، شیعر وەکو کامێرایەك وردەکارییەکانی ژیان دەنووسێتەوە ؛

– بۆیە شیعری تەرزە دەکرێ لە جیهانی گوزارشتگەراوە سەیر بکەین کە خود یەکێکە لە بکەرە هەرە لەبەرچاوەکانی ؛

– شیعرنووسین بە هیچ شێوەیەك کێشەنین و شاعیر وەکو گرفت ئاوڕی لە کردەی نووسین نەداوەتەوە.



سەرچاوە:


1_Tzvetan Todorov, Qu'est_ce que le structurall
.isme. 2.Poétique
.Seuil. 1968, Paris

2_Jean Chevalier, Alain Gheerbrant, Dictionnaire des symboles. ( mythes, rêves, coutumes, gestes, forms, figures, couleurs, nombres), Robert Lafont, .1982, Paris




١

ئەحمەد شاملوو

بەڕۆژ ئاکرەیی

## دیوانی ئەحمەد شاملوو
### چاپکراوی غەزەلنووس

ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، بژاردەیەک لە کۆی دەفتەرەشیعرییەکانی ئەحمەد شاملووی، لە دوو بەرگدا و بە وەرگێڕانی بەڕۆژ ئاکرەیییەوە بڵاو کردەوە.
لەم دیوانەدا، جگە لەوەی لە هەر دەفتەرەشیعرێکی شاعیر چەند شیعرێک وەرگێڕدراوە، هاوکات گفتوگۆیەکی وەرگێڕیشی تێدایە، کە خۆی لەگەڵ ئەحمەد شاملوودا و لە ساڵی ١٩٩٢ـدا ئەنجامی داوە.
بەڕۆژ ئاکرەیی یەکەم نووسەری کوردە، کە گفتوگۆی لەگەڵ ئەحمەد شاملوودا ساز کردبێت. هەروەها، نووسینێکی ڕەزا عەلیپووریش، کە لە بارەی ئەزموون و ڕەوتی شیعریی شاملووەوە نووسیویەتی.
جێی ئاماژەیە، ئاکرەیی، هاوڕێی شاملوو بووە و لەم کتێبەدا ئەو نامانەیش، کە شاملوو بۆ ئاکرەیی ناردوون، بۆ یەکەم جار بڵاو کراونەتەوە.
بەڕۆژ ئاکرەیی، سەبارەت بە وەرگێڕانی شیعرەکانی ئەحمەد شاملوو، لە بەرگی یەکەمی دیوانەکەدا نووسیویەتی: «ئەم شیعرە وەرگێڕدراوانە، بەرهەمی بیستوپێنج ساڵ هەوڵ و هەڵشاخانن بە شیعری شاملوودا. ئاساییە، کە ئەم قسەیەم بەو واتایە نییە، بیستوپێنج ساڵ لەسەر ئەم شیعرانە هەڵکورماوم و کارم لەسەر کردوون، بەڵام دەتوانم بڵێم: بیستوپێنج ساڵ لەگەڵ شیعرەکانی شاملوودا ژیاوم و خوێندوومنەتەوە.»
جێی خۆیەتی ئاماژە بەوەیش بدەین، لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا و لە بەرگی دووەمدا، نامەی ئایدا ـ هاوسەری شاملوو، بۆ وەرگێڕ و هەروەتر نامەی ڕەزامەندیی دامەزراوەی شاملوو ـ لەمەڕ چاپی ئەم کتێبەوە، بڵاو کراونەتەوە.
دیوانی ئەحمەد شاملوو، بە دوو بەرگ، ئێستا لە کتێبفرۆشییەکاندا دەست دەکەوێت.



# لاله

**سادق هیدایەت**
**و. لە فارسییەوە: بابەك سەحرانەوەرد**

لە بەیانی زووەوە گەواڵە هەورەکان لە هاتووچۆدا بوون و بایەکی زۆر ناخۆش هەڵیکردبوو. ژێر دارەکان پڕ بوون لە گەڵای وەریو. گەڵا زەردەکان ناوە ناوە لە هەوا لولیان دەخوارد و ئەکەوتنە سەر ئەرز. پۆلە قەلەڕەشێك بە قارە قار بەرەو جێگەیەکی نادیار دەچوون. ماڵە لادێییەکان لە دوورەوە وەك قاوغی شقارتە کە لەسەر یەکتر هەڵچنرابوون بە پەنجەرەی ڕەش هەڵگەڕاو و بە بێ دەرگا، وا دەهاتنە بەر چاو کە بە هاکەزایی درووست کرابێتن.

خودادا بە ئەردێن و سمێڵی بۆرەوە، گورج و گۆڵ و دڵتەڕ، هەنگاوی قورسی دەنا و هەستی بە هێز و تینی تازە لە گیانی دەکرد. بە ڕواڵەت چاوی بڕیبووە جادە شێدارەکەی بەردەمی خۆی و بەرژەوەندی دەشتاییە دوور ودرێژەکە. با کەوتبووە ناو لەشی وەك ئەوەی بیلاوێنێتەوە. دارەکان وادەهاتنە بەرچاوی کە



دەڵێی سەمایان دەکرد و قەلەڕەشەکان دەڵێی
مزگێنی بەزم و خۆشییان بۆ دەهێنا و هەمووی
ئەم سرووشتە لەبەر چاویدا دڵگیر و ڕووخۆش
بوو. بوخچەیەکی قەڵەمکاری لە باخەڵی
خزاندبوو کە توند بە خۆیەوە چەسپاندبووی.
چاوانی دەبریسکانەوە و هەر هەنگاوێکی دەنا،
بەلەکە پتەوەکانی لە ژێر دەرلنگی پانتۆڵە
ڕەشەکەیەوە بە دیار دەکەوتن.
جل و بەرگەکەی شینی ئاسمانی بوو و
کڵاوێکی لبادی زەردی پێ بوو. خودادادا شەست
ساڵە بوو، پیاوێکی ئێسقان ئەستوور و بە
قەڵافەت و چاوگەش بوو. کەم تاکورت بیست
ساڵی دەخایاند کە خەڵکی دەماوند نەیاندیبوو،
چونکا دوورەپەرێز ببوو و لاسەروی کانی عەلا
لەسەر ڕێگای مازەندەران بۆ خۆی
کۆختەیەکی بە بەرد و گڵ
دروست کردبوو. بیست ساڵ
دەبوو کە ژیانێکی تەنیایی بۆ
خۆی دابین کردبوو. بە دەستە
زبرەکانی عەرزی دەکێڵا، ئاوی
دەدا و وەرزێری تێدا دەکرد.
هەر ئەو ئیشە کە باوك و
ڕەنگە باپیرانی کردبوویان.
جێی هەشتا ڕبە تووی میرات
پێگەیشتبوو کە لە ڕەشەساڵی،
نیوەی زۆرتری فرۆشتبوو. واتە
بە جێی ئارد مامەڵەی کرد. و
ئێستاکە بە دەسکەوتی ئەو
پارچە زەوییە کە بۆی مابوو ژیانی خۆی پێ
بەسەر دەبرد.
ئەو شتەی کە ببووە سەرسووڕماوی
هەمووان ئەمە بوو کە خودادادا لەم چەند
ساڵەی دواییینە لە لادێکان و بە زۆری لە
بازاڕی دەماوەند دەبیندرا کە قوماشی ژنانە
و قەن و چا و وردەواڵە دەکڕێ. برێ جاریش
لە کێوەکانی دەوروبەری ئاوە گەرمە، جابۆن،
گیلیارد ئەویان لەگەڵ کچە قەرەچییەك
دیتبوو.
چوار ساڵ لەمەوبەر لە شەوێکی سارد، ئەو
شەوە ساردانە کە بە چەپۆڵە پۆڵاییییەکەی
خۆی دەموچاوی بنیادەم دائەتاشێت، خودادادا
هەر ئەونە کە چراکەی بە فوو کوژانەوە
و چووە ژێر جێگاوە، دەنگێکی سەیر هاتە
گوێی. هاوار وناڵەی پچڕپچڕ کە دیار نەبوو
دەنگی حەیوانە یان بنیادەم. دەنگەکە لە
پەستا نزیك دەبووەوە هەتا ئەوەی کە
دەرگای کۆخەکەیان کوتا. خودادادا کە نە لە
گیاندار و نە لە بێ گیان ترسی بوو هەستا
و دانیشت و هەستی کرد تنۆکە عارەقێکی
سارد بە گازەڕای پشتی هاتەخوار. هەر
چەندە پرسیاری کرد کێیە و چی دەوێ،
وەڵامێك نەبوو و ئەو کاتەی کە ڕادەکشا
تا بخەوێ هەمیسان لە درگایان ئەدا.
بە دەستی لەرزۆکەوە چراکەی هەڵکرد.
کێردێکی گەورە کە بۆ شکاندنی دار بە
دیوارەوە هەڵواسیبوو،



هەڵگرت کتووپڕ دەرگای کردەوە. زۆرتر سەرسووڕما کاتێ کچۆڵەیەکی قەرەچی بە جلوبەرگی سوورەوە دی کە لە کەرکرۆکی دەرگا وێستاوە و فرمێسك بەسەر گۆناکانییەوە مەییوە و هەڵدەلەرزێ. هێندەی تر سەری سووڕما. خوداداد کێردەکەی فرێدایە سووچێکی دیوەکە. دەستی کچۆلەکەی گرت و بردییەوە ژوور. هاڵاوی ئاگرەکە کچەکەی گەرم کردەوە. ئینجا خوداداد بە جلەکۆنەکانی جێ خەوێکی بۆ درووست کرد.

سەرلەبەیانی هەر چی زۆرتر پرسیاری لێدەکرد بێ وەڵام دەمایەوە. وەکوو ئەوە بێ کە کچۆڵەکە سوێندی خواردبێ زمان نەگێڕێ و هیچ نەدرکێنێ. هەر بەم هۆیە خوداداد ناوی لێنا لاڵ یان لالوو و بەرە بەرە ئەو ناوە بوو بە لالە. ئەو شتەی کە زۆر سەیر بوو ئەوە بوو کە ئێستا وەرزی گەرمیان و کوێستانی قەرەچییەکان نەبوو و خوداداد لێی روون نەبوو لە نێوان عەرز و ئاسمان ئەو کچۆلەیە لە کوێوە هاتووە. لە کوختەکەی وەدەرکەوت وشوێن پێی کچەکەی هەڵگرت، بەڵام شوێن پێیەکانی لەسەر گەڵاوەریوەکان ون دەبوو. لە ئاشەوانەکەی کانی عەلا پرسیاری کرد، ئەویش هیچی نەدەزانی. لە ئەنجامدا بڕیاری دا منداڵەکە ڕاگرێ هەتا کەس و کارەکەی پەیدا دەبن.

لالە کچۆڵەیەکی تەمەن دوانزەساڵی گەنم ڕوو بوو. سیمایەکی شیرین و چاوەکانی گەش و لەبەردڵان بوو. لەسەر دەست و نێوچاوانی خاڵی شینیان کوتابوو. لە ماوەی ئەو چوار ساڵە کە لالە لەو کۆختەیە ژیانی بەسەر دەبرد، خوداداد هەرچەندە سوراخی کەس و کارەکەی کرد، کەس لەو قەرەچییانە نەیاندەناسی. دواتر خوداداد پێی خۆش نەبوو لالەی لە کیس بچێ. هەروەك منداڵی خۆی گلی دایەوە و بەرەبەرە خۆشەویستییەکی سەیری بەو کچە پەیدا کرد. نەك خۆشەویستی باوك و ڕۆڵە، بەڵکوو خۆشەویستی بە چەشنی ژن و مێرد. هەر ئەو کاتە کە وەسوەسەی ئەڤین لە کەللەی دا، لە ناوەڕاستی دیوەکە پەتی بەست و پەردەیەکی کرد بە ناوبڕەی وەتاخەکە هەتا شوێنی خەوتنیان لەیەکتر جیا بێت. ئەوەی کە لە هەمووان خراپ تر بوو لالە خودادادی بە باوە بانگ دەکرد و هەر کەڕەت کە بە خودادادی دەوت باوە، یەکسەر تێکدەچوو. ڕۆژێك خوداداد هاتە نێو ماڵەکە سەیری کرد دوو مریشکی سەربەکڵاو لە بەردەم کوختەکەی چینە دەکەن. هەر چەندە خوداداد ئامۆژگاری لالەی کرد کە دزی خراپە و لە ئاوری جەهەنمدا دەسووتێ، بزیەکی لاسارانە لەسەر لێوی لالە دەنیشت و هەر جار

به بۆنەیەك لەم باس و خواستە
خۆی دەرباز دەکرد.
لالە حەزێکی زۆری لە سەیران
بوو. ئەگەر دووسێ ڕۆژ باران
بووایە و بە ناچاری لە کۆختەکە
بمایە، کپ و خەمگین دەبوو،
بەڵام ئەو ڕۆژانەی کە هەوا
ساماڵ بوو یان بە تەنێ یان
لەگەڵ خودادا دەچوو بۆ
گەشت و سەیران. زۆربەی کات
بە تەنیایی دەڕۆیشت و ئەمە
دڵپیسی خودادادی بە شوێنەوە
بوو. چونکا یەك دووجار عەباسە
شوانی لەگەڵ لالە دیتبوو و
عەباسی بە ڕەقیبی
خۆی دەزانی.
تەنانەت ڕۆژێ
عەباسی دیتبوو
کە تووترکی
دەچنی و دەیکردە
دەمی لالە. هەر
ئەو شەوە کەوتە
سەر کۆنەکردن
و تەشەردان لە
لالە کە نابێت
لەگەڵ پیاوی
غەیرە قسە بکا.
فرمێسك لە



چاوانی لالە قەتیزمان و دڵە دێهاتییەکەی خودادادی پڕ کرد.
دایکی عەباس دوو جار بۆ خوازبێنی لە لالە هاتبوو، بەڵام
هەر جار خوداداد بە بۆنەی ئەوەی کە لالە هێشتا منداڵە،
جوابی کردبوو و لەبەر خۆییەوە ئاوای بیر دەکرد کە ئەم
عەباسە تەمەڵە دەبێتە میراتگری ئەو و هەرچی سەروەت و
سامان کە لەماوەی پەنجا ساڵ پێکەوەی ناوە داگیری ئەکات.
ئینجا ڕۆحی باوباپیرانی چییان پێ دەوت کە لە بری میراتگر،
کەسێکی شڕۆڵە و بێ سەروبەری هەڵبژاردووە کە ناتوانێ
خزمەتی زەوی بکات و لێی داچەنێ. بەر لەوەش کچۆڵەیەك
کە لە کوختەکەی بە خۆی داڵدەی داوە، خواردەمەنی داوەتێ،
جلی بە بەرا کردووە، ڕەنجی پێوە کێشاوە و گەورەی کردووە،
بۆ ئەو وەکوو دارە میوەیەکە کە خۆی پەروەراندویەتی و
بەری هێناوە، زەلامێکی نامۆ بەرەکەی بچنێ. بۆ مەگەر
خۆی دەستی شکاوە؟ ناتوانێ لالە بۆ خۆی بە ژنی بخوازێ
؟ بۆ نا؟ بەس ئەو واهەستی پێدەکرد کە ئەم مەسەلە بەم
ساکارییەش نەبێ و ڕازیبوونی کچەش خۆی مەرجە و ئیتر
ئەم خووە خراپە کە کچەکە بووی و ئەوی بە بابی خۆی
دەزانی، هێندەی دی ناهۆمیدی دەکرد. زۆربەی شەوان کاتێ
کچەکە دەنووست، چراکەی هەڵدەبڕی و قەیرێکی زۆر لە
دەمووچاو، سنگ، مەمك و قۆڵەکانی دەیڕوانی. ئینجا هەر
وەك شێت وەدەردەکەوت بەرەو کێو و دۆڵ ملی پێوەدەنا و
قەیرێکی زۆری پێدەچوو هەتا دەگەڕایەوە. ژیانی ئەو لە نێو
ترس و هیوا تێدەپڕی وترس ڕێی نەئەدا کە ئەشقی خۆی
بۆ دەربڕێت. ئەگەرەکوو لالە دەیوت نا، تۆ پیری. ئەو ئیتر
چاری نەبوو مەگین ئەوەی خۆی لەناو بەرێ. تاشەبەردێکی
زل لە نزیکی کوختەکەی خوداداد هەبوو کە لالە بە زۆری
لەسەری دادەنیشت و بەلەکە سفت و سۆڵە ڕووتەکانی لە
بەردەکە جووت دەکرد

و کاتێکی زۆر بەو دەقە دەمایەوە، بێ ئەوەی کە وەڕز بێ و جاروبار لەبەر خۆیەوە گۆرانییەکی سۆزداری دەخوێند. بەڵام هەر ئەوندە کە کەسێ لێی نزیك دەبووەوە، کتووپڕ بێ دەنگ دەبوو. خودادا بە ڕێکەوت ئەم سترانەی بیستبوو و زۆر دڵی پێوە بوو کە هەمیسان گوێی لێ بێت.
ئەمڕۆ سەرلەبەیانی کاتێ خوداداد دەیویست بۆ شاری دەماوەند بڕوات، لالە لەسەر ئەو تاشەبەردە دانیشتبوو، بەڵام لە ڕۆژانی دی بەدەماخ تر بوو، بە پێچەوانەی جاران نەیدەویست شوێن خودادا کەوێ. خوداداد پێی وت: لەچکەیەکی سوورت بۆ دەکڕم.
بزە مەعسووم و بەختەوەرەکەی لالەی دی کە بەقەد دوونیایەك بایەخی بوو و کاتێ چووە بازارە چکۆلەکەی دەماوەند، سەرەتا چووە دوکانی کووتاڵ فرۆشی و لەچکەیەکی سوور کە گوڵ و جوقەی زەرد و سەوزی پێوەوە بوو، کڕی. ئینجا قەن و چای کڕی، هەر هەمووی خستە بوخچە قەڵەمکار و بە هەنگاوی بەرز بەرەو کوختەکەی کەوتە ڕێ.
بۆ خوداداد کە دائیمە لە ڕێگاوباندا بوو، ئەگەر چی شار هەتا ماڵەکەی دوو فەرسەخ دەبوو، وەك کورتە ڕێگایەك دەهاتە بەر چاوی. ئەگەر چی پیر و کەنەفت ببوو، ئێستا ژیانەکەی جۆرە ئەنجام و مانایەکی تێدا شین ببوو. بەدەم ڕێگاوە لەبەر خۆی کەوتبوە بیر: ئەم لەچکەیە هەر بۆئەو جوانە کە بیدا بەسەر شانیا و سەرەکەی لە ژێر مەمکەکانییەوە گرێ بدات. ئینجا وەك ئەوەی کە هەست بە شەرم بکات، لەبەر خۆییەوە دەیوت: من دەبێ بە جوانی ئەو شانازی بکەم، چونکا لە جێگای باوکی ئەوم و مێردێکی لێهاتووی بۆ پەیدا بکەم! بەڵام ئەم بیرە کە عەباسە شوان لالەی خۆش دەوێ، زۆری پێ پەست بوو.
بە هەوراز و نشیو، بە قەراخ دۆڵ و چیا و دەشتایی تێدەپەڕی. لە ڕێ چاوی بەکەس نەکەوت، هەستی بە چ شتێك نەدەکرد، تەنانەت ماندوویی ڕێگاش تێیدا دیار نەبوو. جاران کاتێ کە ڕێی دەکەوتە لادێکانی دەوروبەر، تەنیا دەیڕوانییە ئاسمان هەتا بزانێت باران دێ یا نا. تەماشای زەوییەکانی دەکرد هەتا دەسڕەنجی خەڵکی ببینێ. پرسیاری نرخی جۆ، گەنم، لۆبیا، قەیسی، سێو، گێلاس، شێلانێ و زۆر شتی دی دەکرد. بەڵام ئێستا بەر لە لالە لە چ شتێ تر بیری نەدەکرد، زەوییەکەی ئەمساڵ باش بەری نەگرتبوو و مەجبوور بوو هەندێ لە دەسکەوتەکەی خەرج بکا، بەڵام تەواوی ئەم شتانە لە داڵغەی ئەودا بە قەد تاڵە قژێکی لالە بایەخی نەبوو. بەدەم ئەم بیرەوە بە کەنار دارەکان

تێپەڕی و چووە سەر ئەو ڕێیە کە لە بەرزاییەکەی
کوختەکەی کە دەتوت دوو قوتوە شقارتەی شەق
و پەقە کە لە پاڵ یەکدا، دانراون، دیار کەوت. پێی
هەڵگرت و گرێ بوخچەی پتر بە خۆیەوە گووشی
و ئەو ڕێگەیە کە چاك لێ شارەزا بوو، تێپەڕاند و
لە سەرووڵێژییەکی دی ڕەت بوو و پێچێکی کرد و
گەیشتە بەردەم کوختەکەی. بەڵام لالە لەوێدا نەبوو،
نە لەسەر تاشەبەرد، نە لە ژوورەوە.
هاتە بەر کەرکەرۆکی دەرگا، دەستی خستە لادەمی،
هاواری کرد: لالە.لالە...! کەسێ وەڵامێ نەدایەوە .
هاتە دەرێ و بە تەواوی هێزیەوە گازی کرد: لالە
لالە...لالو ..لالو. زایەڵەی دەنگی وەڵامی دایەوە لالە...
لالو. ترس و خۆفێکی زۆری تووش بوو. ڕایکردە سەر
تاشەبەردەکەی نزیك ماڵی. لە دەوروبەری ڕوانی. هیچ
ئاسەوارێکی لە جلە سوورەکەی نەدی.
گەرایەوە بۆ ژوور وسەندوقی لالەی
کردەوە، سەیری کرد ئەو جلو بەرگە
تازانەی کە ئەمساڵ بۆی کڕیبوو،
نەمابوون. خەریبوو لە داخا شەقی
دەبرد. سەری لەم کارە دەرنەدەکرد.
هەمیسان وەدەرکەوت و لە کانی
عەلا تووشی مەلای گوند بوو کە بە
فەرەنجییەکی درێژ و کڵاوی شینی
چاکدار و شاڵ و شەڵوارێکی ڕەش
و کەوایەکی سێ چاکییەوە لە بن
دارێکدا دانیشتبوو و سەبیلی دەکێشا.
ئەونە بە ڕقەوە لە خودادادی ڕوانی
کە خوداداد زاتی نەکرد

شتێکی لێ بپرسێ. کەمێك ئەولاترەوە
ژنێکی بە چارشێوی سوور و پانتۆڵی
ڕەش و پرچی هۆنراوەیی بینی کە
منداڵەکەی بە کۆڵیەوە بوو و ئەویش
هیچ هەواڵێکی لالەی پێ نەبوو.
خوداداد بە ناچار زڤرییەوە.
تاریکی شەو هەموو لایەکی گرتەوە
بەڵام لالە نەهاتەوە. چ خەونگەلێکی
ناخۆش کە خوداداد نەیدی. هەر خەو
نەچووە چاوی. هەموو کابووس بوو
و بە هەر لەرەیەك ، هەڵدەستایە
سەرپێ، بە خەیاڵی خۆی لالە
گەڕاوەتەوە. زیاد لە دەجار هەستا
پەردەی لائەدا. بە لەپەکوتێ جێگا
سارد و سڕەکەی لالەی سەح دەکرد
و دەلەرزی و دەکەوتە عەرز. ئاخۆ
کەسێ بەزۆر لەگەڵ خۆی بردوویەتی؟
یان هەڵیان خەڵەتاندووە یا خۆی
ڕویشتووە؟
سبەی بەیانی هەوا سارد و ساف بوو.
خوداداد ئەو لەچکەی کە کڕیبووی،
لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و ڕۆیشت بە
شوێن لالە. لە ڕێگا تەواوی خەڵك
چەشنی دێو و هەژدیها دەهاتنە
بەرچاوی. کێوە شین و بۆرەکان کە
بەفر هەتا ئاست قەدپاڵیان گەیشتبوو
ترسیان دەخستە دڵییەوە. بۆنی پنگ
لە قەراخ جۆگەلە



هەناسەی سوار دەکرد. لە ڕێگا تووشی دوو لادێیی بوو. بە شپرزەییەوە لێی پرسین: ئەرێ ئێوە لالەتان نەبینیوە؟
سەرەتا وایان دەزانی شێت بووە و لە یەکدیان پرسی: کێ؟
کچە قەرەچییەك
یەکێکیان وتی: دووڕۆژە تاقمە قەرەچییەك هاتوون لە لای موومجەح چادریان هەڵداوە.ڕەنگە مەبەستت ئەوانە.
خوداداد ڕێگای موومجەحی گرتە بەر. ئەمجار بە هەڕا و خێراوییەوە هەنگاوی دادەنا و لە چەند ڕێ و پێچەوە تێپەڕی هەتا ئەوەی چەند ڕەشماڵی لە دوورەوە دیاری کرد، کە نزیك بووەوە، سەیری کرد پیاوێ لە قەراغ جۆگەلە خەوی لێکەوتووە. تۆزێ لەولاترەوە ژنە قەرچییەك پەتڵەی لە بێژنگ ئەدا،
ئەو ژنە سڵاوی لێکرد و وتی:
فاڵ دەگرینەوە، مۆرە مارانمان پێیە، هێلکە، بێژنگ، گوێز و...
خوداداد شێت ئاسا وتی:
- لالە. لالوت نەدیوە. نازانی لە کوێیە؟
- فاڵ دەگرینەوە و پێتی دەڵێن.
- دە بڵێ، پارەت دەدەمێ.
- هەقەکەی بدە هەتا پێت بڵێم.
خوداداد ماندوو بوو، دەستی کردە گیرفانی و قڕانێکی دەرهێنا و دایە دەس ژنەکە. ژنەکە دەسی گرت و لە سیمای ورد بوو و وتی:
عەلی پشت و پەنات بێ، پیاوەکە، تۆ ئێستا خەم و خەفەتت لە دڵدایە، چونکا شتێکت لێ ون بووە کە چوار ساڵی ڕەبەق ڕەنجت بۆ کێشاوە. نە منداڵتە، و نە لە منداڵی خۆت کەمترت خۆش دەوێ.
خوداداد بە چاوانی فرمێسکاوی ڕوانییە ژنە قەرەچییەکە و لەبەر خۆییەوە وتی:
- ڕاستە ڕاست.
بەڵام بێ هۆ خەفەت مەخۆ، چونکا ئەو کچە لێتەوە نزیکە، زیندوو و ساخ و سڵامەتە، ئەویش تۆی خۆش دەوێ، بەڵام چ قازانج نییە، چارەنووس کاری خۆی کردووە!
- ئاخر چۆن، چۆن؟ توخوا قسە بکە.

ـ بێ هۆ خەفت مەخۆ، ئەو بەختەوەرە، دەرگای ژوورەکەت بە بەتاکی جێهێشتووە و شەیتان هاتۆتە ژوور و ئەوی هەڵخەڵەتاندووە.

ـ ناوی عەباس نییە؟

ـ نا.

ـ تۆ کێی، چۆن دەزانی، توخوا ڕاستەکەی بڵێ، هەرچیت بوێ پێت دەدەم.

دەستی کرد بە گیرفانی و قڕانێکی تری دەرهێنا و خستیە لەپی دەستی ژنەکە. بەڵام لەم کاتە دی پەردەی ڕەشماڵەکەی تەنیشتەوە لادرا و لالە وەدەرکەوت. هەر ئەو جلە سوورە کە بۆی کڕیبوو لە بەریدا بوو. سێوە لاسوورەیەکیشی بە دەستەوە بوو و بە سەرقۆلی کراسەکەی دەسڕی و قەپاڵی لێدا. ئینجا بەدەم پێکەنینەوە، بە ژنە فاڵ چییەکەی وت:

نەنە، ئەمە باوکە خودادادە. بە دەست ئیشارەتی بۆ ئەو کرد. خوداداد لە سەرسوڕماوی دەمی داچەقی بوو. لێکدا لێکدا لە لالە و دایکی دەیڕوانی بەڵام هەتا ئێستا لالوی وەها شاد و بە کەیفەوە نەبینیبوو. دەستی بردە بوخچەکەی و لەچە سوورەکەی دەرهێنا و خستییە بەردەمی لالە و وتی: ئەمەم لە بازاڕ بۆ تۆ سەند.

لالو بە دەنگێکی بەرز هاتە پێکەنین. لچکەی دا بە



شانیا و لە ژێر مەمکەکانیەوە گرێی دا. ئینجا بە ڕاکردن خۆ گەیاندە بەر ڕشماڵەکە. دەستی پیاوە گەنجێکی گرت و ڕای کێشایە دەر. ئاماژەی بۆ لای خودادادکرد و شتێکی بە پیاوەکە وت. پاشان بە هەمان شێوە تایبەتییەی خۆی لەبەر خۆییەوە و بە پۆزە سفت و سۆڵەکانیەوە کەوتە گۆرانی وتن و دەستی کردە ملی پیاوەکە و بە بن دارە بیەکاندا ڕەت بوون و دوورکەوتنەوە.

خوداداد لە خۆشحاڵی و خەمەوە دەگریا. بە لەقە لەق لە هەمان ڕێ کە هاتبوو گەڕایەوە و چووە نێو کوختەکەی و درگای لەسەر خۆی داخست و ئیدی هیچ کەسێ نەیدییەوە.





# پاشەڕۆژی سینەما... گەڕانەوە بۆ خەون؟

ئاودێر کاکەی فەلاح

هەرچۆن زۆر لە ڕەخنەگرانی سینەما سەدەی بیستەم بە سەدەی سینەما لە قەڵەم دەدەن، هەر بەو پێیە هەندێکیان سەدەی بیست و یەکیش بە سەدەی لەناوچوونی ئەم هونەرە ناودەهێنن. لەوانەیە لەناوچوونی سینەما وشەیەکی ڕاست نەبێت و ڕۆژگار بەدرۆی بخاتەوە، بەڵام ئەوەی جێی گومان لێکردن نییە، ئەو گۆڕانە سەرتاسەرییەیە کە سەرتاپای ئەم هونەرەی گرتۆتەوە. گۆڕانێکە کە وا لە هونەری فیلم دەکات، بەم شێوەیەی کە نەوەکانی ئێستا پێی ئاشنان، لەم بیست تا پەنجا ساڵەی داهاتودا بوونی نەمێنێت و بەتەواوەتی شێوە و چۆنێتی سەیرکردنی بگۆڕێت. خاڵێك کە جێی سەرنج بێت، ئەو تێڕوانینە هاوبەشەی زۆر لە ڕەخنەگرە ناودارەکانی ئەمریکا و بەریتانیایە لەسەر ئەم بابەتە. لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا چەندین نووسین لەسەر ئەم قەیرانە لە گۆڤارە گەورە و ماڵپەڕە گرنگەکانی ئینتەرنێتدا بڵاوبۆوە. بۆ نموونە «دەیڤید دێنبی»



لە گۆڤاری نیو ڕیپۆبلیك دا بابەتێکی بەناوی «ئایا هۆلیوود فیلمی لەناو برد؟» بڵاوکردەوە. لەم نووسینەدا ڕەخنەگر سکاڵایەکی گەورە لە فیلمە نوێکانی هۆلیوود دەکات و زۆربەیان بە منداڵانە و بێمانا لە قەڵەم دەدات. بە دەیەها نموونەی فیلمی نوێ دەهێنێتەوە کە گشتیان هاوشێوەی یەکن و بۆ یەك مەبەستیش دروستکراون. هەروەها ڕەخنەگری بەریتانی «دەیڤید تۆمسن» لە هەمان گۆڤاردا باسێکی هاوشێوەی بە ناونیشانی «سینەمای ئەمریکی نەمردووە، بەڵام گیان دەدات» بڵاوکردەوە. لە باسەکەیدا نووسەر ئاماژە بەو ڕاپرسینە گەورەیە دەدات کە دەساڵ جارێك گۆڤاری سینەمایی ئینگلیزی سایت ئاند ساوند پێی هەڵدەسێت. ئەم گۆڤارە کە ناسراوترین و گرنگترین گۆڤاری سەینەماییە لە جیهاندا، لە ساڵی ١٩٥٢ ەوە، بەم ڕاپرسینە هەڵدەسێت. دواجار لە ساڵی ٢٠١٢ دا ٣٥٨ ڕێژیسیۆری بەناوبانگی سینەمایی و ٨٤٦ ڕەخنەگری ناوداری فیلم لە جیهاندا لەم ڕاپرسینەدا بەشداربوون. مەبەستیش لەم ڕاپرسینە، زانینی لیستی باشترین دە فیلم لە مێژووی سینەمادایە. تۆمسن لە بابەتەکەیدا باسی قەیرانی نەبوونی فیلمی نوێی باش دەکات. لەم لیستی



باشترین دە فیلمەدا، هیچ فیلمێکی تیادا نییە کە لە دوای ساڵی ١٩٦٨ ەوە درووست کرابێت! تەنانەت لە لیستی باشترین پەنجا فیلمدا، تەنها دوو فیلمی تیادایە کە دوای ساڵی دوو هەزار درووست کرابن!
هەرچەندە ئەم ڕاپرسینانە تەنها ڕای خودی کەسەکانە و ئەستەمە بوارێکی ئاڵۆزی وەك هونەری سینەما بە ڕاپرسین و پۆلێن کردن، بتوانرێت ئاستی هونەریی فیلمێك یان باشی و خراپی دیاری بکرێت. بەڵام لە سەرێکی ترەوە، ئەم ڕاپرسینە تەنها ڕاپرسینە لەم بوارەدا لە جیهاندا، کە لە ئاستێکی وا بەرز و بەرفراواندا بکرێت و مرۆڤ بتوانێت بە چاوێکی جدییانە سەیری بکات. بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا، ئەم ڕاپرسینە چەند هێمایەکی لە خۆگرتووە و ئاڕادەیەك ئاراستەی گۆڕانکارییەکانی ئەم هونەرەمان نیشان دەدات.
هەڵبەتە ئەو ڕاستیەی کە هیچ فیلمێك لە دوای ساڵی ١٩٦٨ ەوە لەم ڕاپرسینەدا خۆی نەبینیوەتەوە، هێمایەکی ترسناك و ورياکەرەوەیە. بەڕای زۆرینەی ئەو هونەرمەند و ڕەخنەگرە سەینەمایيانە، هیچ فیلمێك لەم چڵ و چوار ساڵەی ڕابوردوودا دروستنەکراوە، کە شایستەی لیستی باشترین فیلمەکان بێت. ئەم خاڵەش قەیرانێکی گەورەی سینەمای هاوچەرخ نیشان دەدات و



پێشبینی دوارۆژێکی تاریکی ئەم هونەرەی لە خۆگرتووە.
بە بڕوای من قەیرانەکە تەنها نەبوونی یان کەمی فیلمی باش نییە، بەڵکو زیاتر، زۆری فیلمی خراپە. ئەم فیلمانە ژمارەیان هێجگار وا زۆرە و بڵاوبوونەوەیان وا فراوانە، کە مەترسییەکی ڕاستەقینەیان بۆ سەر سینەما وەك هونەر و تەنانەت وەك دیاردەیەکی کولتوری هەیە.
مەترسییەکی تریش کە لە ڕیزی هەردوو ئەم جۆرە فیلمانەدا خۆی ماتداوە، مەترسی فیلمە «خەتابارە گەورەکانە». مەبەستم لەم فیلمانە ئەوانەیە کە بەو شێوە و داڕشتنەی ئەم فیلمانە هەیانە، لەم هونەرە دووردەکەونەوە و بەرەو داهاتویەکی نادیاری دەبەن.
ئەوەی سەیرە کە زۆر لە ڕەخنەگران و هەندێك لە فیلمسازان بە درێژایی مێژووی سینەما، چەند نموونەیەکیان هەمیشە هەبووە، کە بە خەتاباری گەورە لە قەڵەمی بدەن.
لەژێر ناونیشانی
**A Brief History Of The Death Of Cinema**
لە ماڵپەڕی سینەمایی ناوداری
**indiewire**
دا باسێکی تاڕادەیەك پێکەنیناوی ئەم فیلمە خەتابارانەی تیادایە. سەرەتای ئەم دیاردەیە تەنانەت دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی بیستەکانی چەرخی ڕابوردوو! هەر سەردەمە و چەند فیلمێك بە خەتابار لە قەڵەم دراون. هەندێکیان بە ستەم وەك فیلمێکی لەم جۆرە ناونووس کراون. ئەوەی سەیرە، لە کاتی خۆیدا هەندێك لەم فیلمانە بە سەرەتایەك بۆ مردن و لە ناوچوونی هونەری سینەما دانراون، کەچی ئێستا بە یەکێك لە فیلمە زۆر باشەکان لە مێژووی سینەمادا دادەنرێن! لە هەمان ئەو ماڵپەڕەشدا دەتوانن هەردوو نووسینەکەی «دێنبی و تۆمسن» بخوێننەوە.

وەك دەبینن، ئەم لێکدانەوە ڕەشبینانە لە سەر داهاتوی سینەما، چەند ساڵێکی زۆرە باسیان لێوەدەکرێت. بەڵام خاڵێك کە جێی گومان نییە، هیچ کاتێك ئەم هونەرە وەك ئێستا لە مەترسیدا نەبووە. ئەو هێرشە بە کۆمەڵەی کە تەلەفزیۆن





و ئینتەرنێت و یاری کۆمپیوتەر چەند ساڵێکی زۆرە بۆ سەر سینەمای دەکەن، وا ئێستا شوێنەواری بە ئاشکرا بە لەشی ئەم هونەرەوە دیارە و دەم و چاویان بە تەواوەتی شێواندووە.
هەروەها تەشەنەکردنی بازاڕی «د.ڤ. د» و «بلو ڕەی»، وایان لە ملیۆنەها کەس کردووە لە ماڵەکانیاندا «سینەمایەکی گچکە!» بۆ خۆیان دروست بکەن.
کلتوری چوون بۆ سینەما لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا کەم بۆتەوە و بۆ زۆر کەس بە کارێکی گرنگ و پێویست دانانرێت.
هەروەها زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان لەم چەند ساڵەی ڕابوردوودا، بڵاوبوونەوەیەکی هێجگار فراوانیان بەخۆیانەوە بینیوە، نەك تەنها زۆربەی کاتی پەخشی زۆر لە کەناڵە تەلەفزیۆنێکانیان پڕکردۆتەوە، بەڵکو لەسەر ئاستی بازاڕی «د.ڤ.د»شدا، داهاتێکی خەیاڵیان بۆ کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکانیان بەدەستهێناوە.
سینەمای هۆلیوودیش بۆ ئەوەی لەم داهاتە زۆرانە بێبەش نەبێت، هاتووە هەوڵی سوودوەرگرتنی لەم دیاردەیە داوە. ئەگەر لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکانی چەرخی ڕابوردوودا تەنها فیلمە، لەڕووی داهاتەوە زۆر سەرکەوتووەکان و گەورەکان، بەشی دوو یان سێیان لێ بەرهەم بهێنرانایە، ئەوا ئێستا هەچ فیلمێك تۆزێك پارەهێنەربێت، ستۆدیۆکانی هۆلیوود هەرخێرا چەند بەشێکی لێ درووست دەکەن. ئەم دیاردەیە تەنانەت چەندین فیلمی بچووکیشی گرتۆتەوە، وەك فیلمە کۆمیدی یان خێزانێکان.
هەڵبەتە ئەمە لە سەرێکەوە بۆ ستۆدیۆکان لە ڕووی داهاتەوە زۆر سوودبەخشە، لە سەرێکی تریشەوە، تێرکردنی بینەرێکە، کە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاشنایەتی لەگەڵ تەلەفزیۆن و زنجیرە تەلەفزیۆنێکاندا زیاتر و بەهێزتر دەبێت.
هەروەها بڵاوبوونەوەی ماڵپەڕە تایبەتیەکانی ئینتەرنێتیش، وەك یوتیوب و ماڵپەڕە فیلم پەخشکەرەکان، کاریگەریەکی هێجگار خراپیان لە سەر هونەری سینەما هەیە و لە گرنگی و تایبەتمەندێتی ئەم هونەریان کەم کردۆتەوە. لەم پلاتفۆرمانەدا سینەما خاسڵەتی خۆی وەك بۆنەیەکی گرنگ یان تایبەتمەند و دانسقە لەدەستداوە. نەوەیەکیان بەرهەمهێناوە کە هەست بە پێویستی چون بۆ سینەما نەکات. ئارەزوویەکی وایان لا دروستبووە، کە هەموو کاتێك و لە گشت شوێنێك بیانەوێت، دەتوانن بە پێی زەوقی خۆیان و زۆر جار بە خۆڕایی، تەماشای ئەم فیلم و ئەو





فیلمە بکەن. هەروەها بەو قەبارە بچووکەی ئەم پەنجەرەی فیلم سەیرکردنانە هەیانە، هەستی گەورەی و جوانی وێنەی سینەماییان لەلای زۆر کەس شێواندووە.
بەڵام بە ڕای من گەورەترین هەوڵی شێواندنی ئەم هونەرە، ئەو هێرشە بەرفراوانەیە کە یاری کۆمپیوتەر وا چەند ساڵێکە دەیکات. لەم شەڕەشدا ئێستا سینەما دەبێت دان بە شکستی خۆیدا بهێنێت. یاریەکانی کۆمپیوتەر لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا لە ڕووی داهاتەوە قازانج بەخشترین بواری «ئینتەرتەینمێنت»ە لە دونیادا. لە ساڵی ٢٠٠٤ دا بۆ یەکەمین جار ئەم بوارە داهاتی لە داهاتی هۆلیوود  زیاتر بوو.
یاریەکی وەك بەشی سێی
**Modern Warfare**



لە ساڵی ٢٠١١ دا، تەنها لە شانزدە ڕۆژدا، یەك بلیۆن دۆلاری بۆ کۆمپانیای بەرهەمهێنەری بەدەست هێنا!
ئەگەر ڕۆمانسیانەش بیرکەینەوە و بڵێین، هونەر و لایەنی دارایی پەیوەندیان پێکەوە نییە، ئەوا هەر بواری یاری کۆمپیوتەر لەسەر ئاستەکانی تریش سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە. لە سەرێکەوە توانیویەتی جوانکاریەکانی سینەما و زمانی سینەمایی و گێڕانەوەی چیرۆکێك بە وێنە، بۆ خۆی ببات و سوودیان لێ وەربگرێت. وە لە سەرێکی تریشەوە، توانیویەتی کارلێکردنێکی گەورە لەسەر سینەمای خۆرئاوا و بە تایبەت ئەمریکی بکات. هەر لە کۆتایی چەرخی بیستەمەوە و هەردوو فیلمی «لۆلا ڕادەکات»ی ئەڵمانی و «ماتریکس»ی ئەمریکییەوە. ئەم دوو فیلمە و کاریگەریەکانی یاری کۆمپیوتەر لە سەریان، لە ژمارە دووی ئەم گۆڤارەدا، درێژتر باسم کردوون، تاکو فیلمی ئاڤاتار و فیلمە هاوشێوەکانی تری لەم جۆرە، کە ڕۆژانە بە دونیادا بڵاودەبنەوە. ئەمە بێجگە لەوەی کە زۆر لە فیلمەکانی هۆلیوود یەکسەر دەکرێن بە یاری کۆمپیوتەری و لە لایەکی تریشەوە، زۆر لە یاریێکانیش بە فیلم دەکرێن.
هەروەها سەرکەوتنێکی تریشی ئەم یاریانە لەسەر ئاستی سایکۆلۆجییە. نەوەیەکی نوێ بەم یاریانە و بە دونیای کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت بە خێوکراون و گەورەبوون. وەك چۆن بۆ نەوەکانی چەرخی بیستەم بە گشتی، سینەما بوارێکی

گرنگ و تا بڵێیت سەرنجڕاکێش بوو. بۆ نەوەی منداڵ و گەنجی ئێستاش، ئەم یاریانە مایەی خۆشییەکی گەورەن و زۆربەی کاتیانی پێوە دەبەنە سەر.
لە گەڵ کوڕەکەی خۆمدا، کە تەمەنی نۆ ساڵە، ڕۆژێك پێکەوە سەیری فیلمێکمان دەکرد، کە فیلمەکە تەواو بوو یەکسەر پرسیاری ئەوەی لێکردم، کە ئایا یاری کۆمپیوتەر بۆ ئەم فیلمە هەیە؟ وەك دەبینین نەوەی نوێ تەنها بە تەماشاکردنی فیلمێك ڕازی نابێت و دڵی ئاو ناخواتەوە. لەبەر کەمی پەیوەندی ڕاستەقینەیی و جەسەدی بە ژیانەوە، ئەم نەوەیە پێویستی بەم جۆرە یاریە «ئینتەرئەکتیڤانەیە»، تاکو نوقسانیە کۆمەڵایەتی و دەروونیەکانی پێ پڕبکاتەوە و تێریان بکات.
هەر وەك چۆن لە فیلمی ئاڤاتار دا پاڵەوانی فیلمەکە کەم ئەندامە و توانای ڕۆیشتنی نییە، بەڵام کاتێك دەیبەن بۆ هەسارەی پاندۆرا و لەوێ ئاڤاتارێکی بۆ دروستدەکەن، پاڵەوانەکە بە یارمەتی ئەو بوونەوەرە، دیسانەوە دەتوانێت بڕوات و تەنانەت زۆر خاسڵەتی تری نایابی دەستدەکەوێت. تاکو لە ئەنجامدا نایەوێت بە هیچ شێوەیەك بگەڕێتەوە بۆ ناو ژیانی ڕاستەقینەی خۆی و ببێتەوە بە مرۆڤ.
ئەم فیلمە لە ڕاستیدا بە پێی ئاوات و خواستی ئەم نەوە نوێیە دروستکراوە. بوونی ئاڤاتارێك بۆ نەوەی کۆمپیوتەر حەزێکی گەورەیە، بوونەوەرێکی خەیاڵی کە گەورەتر و ئازاتر و فرەلایەن تر بێت لە بوونی ڕاستی خۆیان و ژیانی ڕۆژانەیان. ئەم جۆرە یاری و فیلمانە وەك ئاوێنەیەکی خەیاڵی وان، کە خۆمانێکی فەنتازی تیادا دەبینین.
هەر بۆیە یاریەکانی ناسراو بە
**Ego Shooter**
لە هەموو یاریەکانی تر ڕەواجیان زیاترە و باشتر دەفرۆشرێن. لەم یاریانەدا کەسی یاریکەر لەگەڵ فیگوری سەرەکی ناو یاریەکەدا یەکدەگرن و تێکەڵ بەیەکدەبن. کەسی یاریکەر لە یاریەکەدا تەنها دەستی خۆی یان چەکەکەی دەستی دەبینێت و ئاراستەی سەیرکردنی لەگەڵ فیگوری یاریەکەدا تێکەڵ دەبێت.
فیلمی ئاڤاتاریش لەسەر شێوەی یاری
**Third Person Shooter**
هەڵبەستراوە. «کەسی یاریکەر/ پاڵەوانی فیلمەکە» دەچێتە ناو جیهانێکی ترەوە، ئێمە پاڵەوانی فیلمەکە دەبینین و جیهانی «یاریەکە/ فیلمەکە» لە دیداری ئەوەوە دەبینین و بە پێی هەڵسوکەوت و تاقیکردنەوەکانی ئەو، لەو دونیایە حاڵی دەبین. لەم فیلمەدا «مرۆڤە بێ دەستەڵاتەکە/ یاریکەرەکە» دەچێتە دۆخێکی فەنتازییەوە و هەسارەیەکی





فەنتازی لە پیسی و پۆخڵەوات و تەماعی مرۆڤە واقیعییەکان پاك دەکاتەوە.
جیهانی فیلمەکەی جەیمس کامیرۆن لە سەدا هەشتای لە ناو کۆمپیوتەردا 3Dدروستبووە. ئەمە بێجگە لە پشت بەستن بە تەکنەلۆژیای
لەم ڕێیەوە تێکەڵاو بوونی «بینەر/ یاریکەر» لەگەڵ دونیای فیلمەکەدا بەهێزتر و چڕتر بۆتەوە.

هەڵبەتە ئەم بوارە تەکنیکیە نوێیانەی ڕۆژ بەڕۆژ دێنە ناو سینەماوە، بەرپرسی یەکەمن لەو گۆڕانکاریە گەورانەی کە بەسەر ئەم هونەرەدا دێن. سینەما چونکە خۆی بە پێچەوانەی زۆر لە فۆرمە ئەدەبی و هونەرێکانی ترەوە لە ئەنجامی داهێنانی زانستی و پێشکەوتنی تەکنیکییەوە هاتۆتە کایەوە، نەوەك لە ئەنجامی بیرۆکەیەکی فەلسەفی یان گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی. هەر بەو پێیەش زۆربەی گۆڕانکاریە گەورەکان لە مێژووی سینەمادا، لە ئەنجامی پێشکەوتنی تەکنیکەوە بوون، وەك دۆزینەوەی مۆنتاژ، پەیدابوونی فیلمی دەنگدار، فیلمی ڕەنگاوڕەنگ و هتد...

هەروەها گۆڕانکاریە بەشێوە فیکریەکانی مێژووی سینەماش، وەك هاتنە کایەی ڕیالیزمی نوێی ئیتالی و شەپۆلی سینەمای نوێی فەرەنسی، لە ناوەرۆکدا هەر هۆی تەکنیکی بووە، کە ئەم شەپۆلانەی لێ کەوتۆتەوە. نەبوونی تەکنیك و ئامێری پێویست بۆ دروستکردنی فیلم، هەروەها نەبوونی ستۆدیۆی وێنەگرتن، وای لەو فیلمسازانە کردووە، بچنە سەر شەقامەکان و جۆرە فیلمێکی جیاواز لە فیلمە باوەکانی ئەو کاتە بەرهەم بهێنن.
بۆیە لەو بڕوایەدام هەر ئەو تازەگەریانەی بواری تەکنەلۆژیا دەبن، وەك یاری کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و سۆفت وێرە جیاوازەکان، کە گۆڕانێکی کوشندە لەناو هونەری سینەمادا دەکەن و بەرەو داهاتویەکی تەواو جیاواز لە ئێستای دەبەن.
یەکەم قوربانی ئەم گۆڕانکاریانەش بەڕای من، هۆڵی سینەما دەبێت. لە داهاتودا بۆ بینینی فیلم پێویست بە شوێنێکی وەك هۆڵی سینەما ناکات. فیلم لە داهاتودا ڕۆڵی بینەر لە کەسێکی تەنها سەیرکەرەوە بۆ کەسێکی بەشداربوو دەگۆڕێت.

لە پێشدا باسی فیلمی ماتریکس مان کرد، کە چۆن زیاتر لەسەر فەلسەفەی یاری کۆمپیوتەر هەڵبەستراوە. ئەوەی سەیریشە لەم فیلمەدا، پاڵەوانی فیلمەکە





نیۆ، بە ڕۆژ لە کۆمپانیایەکی کۆمپیوتەر کاردەکات، بە شەویش جۆرە پرۆگرامێکی کۆمپیوتەر، بە ڕەش بە گەنجەکان دەفرۆشێت. ئەم پرۆگرامە تێکەڵێکە لە سینەما و مادە بێهۆشکەرەکان! هەر کەسێك بە کاری بهێنێت، ئەوا خۆی بە کردار دەچێتە ناو دونیایەکی سەیر و سەمەرەوە و دەبێت بە پاڵەوانی چیرۆکێك.
بینینی فیلم لە ڕاستیدا لە بینینی خەونەوە نزیکە. هەر بەو پێیە کەسی خەوتو لەوانەیە لە داهاتودا بە یارمەتی پرۆگرامێکی تایبەتی، خۆی بە شێوەیەکی «ئینتەرئەکتیڤانە» لە فیلمێکدا بەشداربێت و خۆی هەڵسوکەوت لە فیلمەکەدا بکات و بڕیارە گرنگەکان بدات.

جارانی زوو لە هۆڵی سینەمادا ئەگەر بەکرەی فیلمەکە بپچڕایە، ئەوا هەندێك لە بینەران هەڵدەسان و دەچوون بۆ پەنجەرەی بلیت فرۆشتنەکە و داوای پارەکەی خۆیان دەکردەوە. بەڵام لە داهاتودا ئەگەر پرۆگرامەکە لە کاتی «خەوا فیلم» بینیندا تێکبچێت و نەتوانین لە خەونەکانمان بێینە دەرەوە، ئایا کێ دەتوانێت داوای پارەکەی خۆی بکاتەوە؟

ناوەڕاستی ٢٠١٣



Ontology of silence

# ئەنتەلۆگیای بێدەنگی

رەووف بێگەرد
عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا
شێرزاد حەسەن
ئەنور ڕەشید عەولا

## ئەنتەلۆگیای بێدەنگی

بۆ ئەبێت ئێمە بێدەنگ بین؟ ئەی بۆ نەبین؟! ئایا کام لە بیدەنگی باشە و کامە خراپە؟ چەندە بێدەنگی ماناکانی لە کلتور و دین و ئایدۆلۆژیاوە هێناوە؟ ئایا ڕۆشنبیریی چەندە ئەتوانێت کۆدی ئەو مانایانە هەڵبوەشێنێتەوە کە بێدەنگی توانیویەتی ئینسانەکان لە ناو کۆمەڵگادا گیرۆدە و ماڵی بکات بە مەبەست گەلێکی دیاریکراو. کەوایە ئەبێت بێدەنگی لەناو هەموو ئەم مانا جیاواز و شێوازە جیاوازانەی ژیاندا چی بێت؟ ئەم ئەنتۆلۆگیایە هی هەموو ئەو کەسانەیە کە لەم گۆشەیەدا باس لە تێگەیشتنی خۆیان بۆ بێدەنگی و بێدەنگی خودی خۆیان ئەکەن.
بێدەنگ بن بزانن ئەم کەسانە بە باکگراوندە ڕۆشنبیرییە جیاوازەکانیانەوە لە ڕێی شکاندنی بێدەنگییەوە چۆن باسی بێدەنگی ئەکەن.



ئەگەر زەوی ئینسان و
ئاژەڵی لەسەر نەژیایە ئەوا
بێدەنگ ئەبوو.

ڤیکتۆر، تەمەن شەش ساڵ

# ڕەووف بێگەرد

دەنگ و بێدەنگیی دوو چەمکی ئەوەندە لە یەك جیاوازنین کە وەك ئانتیەکی یەکدی تەماشا بکرێن یان نەتوانیت لە پێناوی یەکێکیاندا لەگەڵ ئەوی تر هەڵنەکەیت. ئەگەر واز لە لایەنە فیزاویەکە بهێنین هەردووکیان هەڵوێستی مرۆڤن لە هەل و مەرجی جیاوازدا بەرانبەر دیاردەکان بەگشتی بە هەموو ڕەهەند و چەمکە جیاوازەکانیەوە. بەو مانایەی چۆن بەرانبەر هەڵوێستێك یان حاڵەتێك دەشێت بێدەنگ نەبیت و تەنانەت دەنگیش زیاد لە ڕادەی خۆی بەرزبکەیتەوە، هەر ئاوایش دەشێت دەربڕینەکەت بێدەنگیەکی ڕووت بێت کە ئەوییش

لە خۆیدا هەڵوێستە. لەوانەیە زۆر جار زەبر و سەنگینی ئەمیان لە دەنگەکە، بەهێز و کاریگەرتر بێت. تایبەتمەندیی دەنگ لەوەدایە - ئەوەی بێدەنگیی پێی ناکرێت - ئامرازیی سەرەکیی پەیڤاندنە و کۆمەڵگایش بێ هەڤپەیڤین ناتوانێت نە پارێزگاریی لە بوونی خۆی بکات و نە لە بەهاکانی (دیارە هەر هەمان ئەو کەرەسەیە هۆیەکیشە بۆ بێ بەهاکردن و لەناوچوونیشی)

دەنگ لە کلتووری خۆرهەڵاتیدا لە بەشێکیدا تارادەیەک شێوازێکی خۆ نمایش کردنە. تاك دەیەوێت لە ڕێگای دەنگەوە توانای خۆی بسەلمێنێت، بەتایبەتیی بە دەنگ هەڵبڕین یان شاتەشات کردن، چ پیاو و چ ژن (بە جیاوازیی تۆن و دوو ڕەگەی دەنگەکەوە) یان دەتوانین وای ناوزەد بکەین کە دەنگ هەڵبڕین لەم کۆمەڵگەیەدا بوە بە بەشێك لە کەسایەتی تاکەکانی. نووسەرێکی عەرەب لە کتێبێکدا بە ناوی (عەرەب دیاردەیەکی دەنگیە) باس لەو دەم بە هاواریەی عەرەب دەکات (چ لەسەر ئاستی تاك و چ لەسەر ئاستی میدیا) کە بووە بە بەشێك لە کەسایەتیەکەی و ناتوانێت دەست بەرداری بێت. بە ڕای من ڕەگی ئەم کلتووره لای ئەوان لە قووڵیدایە، شیعر و پیاهەڵدان یان داشۆرین و شەڕی خێڵ و عەشیرەتە عەرەبەکان سەرتاپاڕێژن لەو دەنگە حەماسییە. من وادەزانم تەنانەت بانگ دانیش بەم ڕیتمەی تا ئێستا ماوەتەوە هەر بەشێکە لەو کلتووره.

لە بواری چالاکیە مرۆییەکاندا دەنگ کەرەسەی سەرەکیی گەیاندن و بڵاوبوونەوەیە. بۆ نموونە کاتێك فەیلەسووفێك، بیرمەندێك، ڕۆحانیەك دەپەیڤێت زۆربەی زۆریی خەڵکیی لەسەر هەموو ئاستێك دەتوانێت گوێی لێ بگرێت و لێی تێ بگات (سوکراتی فەیلەسوف هەمیشە بەو ڕێگایە بیرەکانی هەڵدەهێنجا)

دەشێت بێدەنگیی بێزارکەربێت. بەڵام وەك وتم زۆرجار لە دەنگ کاریگەرترە. بێدەنگیی هەر بە مانای قایل بوون نییە. بەڵکوو نارازی بوون و سەنگەر گرتنیشە لە بیری باو و هەڵوێستی ناچیز.

بێدەنگیی لای کاراکتەرەکانی نووسەری گەورە دۆستویفسکی سامناك و پڕ لە مەترسییە. تۆ لە چرکەساتی بێدەنگیەکەیاندا هەست بە ڕوودانی ئاژاوە و کارەساتێك دەکەیت، چ لە ناوەوەی خۆیاندا و چ لەو نەخشەسازیەدا کە بۆ ئایندەی دەکەن (هەندێك لە کاراکتەرەکانی ڕۆمانی شەیتانەکان لەم بابەتەن، واتا لەو کاتەدا کە بێدەنگە لە ناوەوەیدا تەواو خرۆشاوە و چەندین پیلانی گەورەی لە بەرنامەدایە) بۆ نموونە (پیوتەر ستیپانڤیچ و





ستاڤروگین و چەندانی تر) هەروەها بۆ نموونە بێدەنگیی (سمیر دیاکۆف) لە ڕۆمانی برایانی کارامازۆف دا بەرانبەر بە کوژرانی باوکی و (ڕاسکۆڵینکۆف) لە کوشتنی (ئالینا ئیڤانۆڤنا)ی پیرێژندا. بە پێچەوانەوە بێدەنگیی لای کاراکتەرەکانی کافکا ڕەهەندی خۆخواردنەوە و بیرکردنەوە و ترس و نیگەرانی و دیالۆژی نێوان خود و ئەویتریەتی. لای کافکا بێدەنگیەکە درێژخایەنە. چونکە ڕامانە لە خود و دەوروبەر و ئەو مەترسیانەی بەتەمای ڕوودانیانن. بێدەنگیی (پرۆتس) و (یاگۆ) لەوپەڕی ترسناکیدایە. کورد دەڵێت: لە ئاوی خوڕ مەترسە لە ئاوی مەنگ بترسە. مەنگ بێدەنگییە.

بێدەنگیی بۆ من حەوانەوەیەکی دەروونی و جەستەییشە. بیرکردنەوەیە لەو کارە نیوەناچڵانەی بە گیریان هێناوم. یان ئەو کەسایەتیەی ڕام نابێت و بە سەرچڵی لەدایك بووە. بە هەموو حاڵەتێك پرۆسەی نووسین و خوێندنەوە لە دۆخی بێدەنگیدا لە هەڵکشاندایە. مارسیل برۆست لەکاتی نووسیندا دەرگا و پەنجەرەی ماڵەکەی دادەخست و تەنانەت بە فلین درز و قەڵەشەکانی دەر و دیواری دەگرت بۆ ئەوەی گوێی لە جریوەی چۆلەکەیش نەبێت. بۆیە توانی بەرهەمێکی گەورەی وەك ڕۆمانی (گەڕان بەدوای زەمەنی بەسەرچوودا) بنووسێت، زۆربەی زۆری نووسەر و هونەرمەند و بیرمەند و داهێنەری دنیا زۆر لە بێدەنگیدا ژیاون و دووربوون لە هەرا و زەنای ڕۆژانەی ژیان. بێدەنگیی دۆخی بەخۆداچوونەوە و بیرکردنەوە و هەوڵدانە بۆ تێ گەیشتن. تێ گەیشتن لە نهێنیەکانی ئەم گەردوونە کە تائێستا، بە هەموو توانا و تۆڕە بەرفراوانەکانی تەکنەلۆژیاوە تەنانەت نیوەیشی نەدۆزراوەتەوە و لەوانەیە مرۆڤ فریای دۆزینەوەیشی نەکەوێت. جوانیی بێدەنگیی لەوەدایە کە بەردەوام لە ڕەش و سپیەکان ڕادەمێنیت، ڕەنگە پاشان بگەیتە ئەو ڕاستیە کە دەشێت هەموو ڕەشەکان سپی بکرێنەوە. یان هەر لای خۆتەوە ڕەشی نەهێڵیت، ئیتر هەوڵێکە و لە بێدەنگیدا نەبێت ناکرێت.



بێدەنگی بۆ پیرەمێردێک
ئەوکاتەیە کە ژنە
چەنابازەکەی ئەخەوێت.

یاسەمین،
تەمەن سیانزە ساڵ

# عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا

هەوڵدەدەم قسە لە دوو جۆر بێدەنگی بکەم، بەڵام دەشێ پرسیاری خوێنەر ئەوە بێ، کە ئەو دوو جۆرە لە بێدەنگی کامانەن؟ ئایا چۆن رووخساری بێدەنگی وەك ئاگاییەك، یان رەوانبێژییەك، یان جوانییەك... بەرجەستە دەکەین؟ دەسەڵاتی بێدەنگی، کارفرمای بێدەنگی....هتد چی دەگەیەنێت؟ دەشێ جوانی بێدەنگی هەوڵێك بێ، بۆ برینی داخراوی رێگا پێنەدراوەکانی دەسەڵاتی چەسپاو، بە مەرجێك لە دەرئەنجامی کەشفکردنی نادیار و شاراوە و چەپێنراوەکانەوە.. قسە لە بێدەنگی بکەین! بەڵام چۆن دەچینە نێو جوگرافیای بێدەنگییەوە؟ ئەو رستەیە بەرەو بێدەنگییەك رابەرایەتیمان دەکات، کە تا سنوورێکی زۆر کاریگەری خۆی بە سەر شتەکانەوە پرۆسیسە کردبێ، بە ئەندازەیەکی گەورە جێکەوتەی





خۆی هەبێت. بەو مانایەش دەبێ
بڕوامان بەوە هەبێ، کە هەمیشە
لە ناخی ناخەوەی ئاگاییەوە
بێدەنگییەك خۆی حەشار داوە،
بەڵام ئایا دەتوانین ئەو بێدەنگییە
ئەکتیفە، لە بێدەنگی نائەکتیف
جیا بکەینەوە؟!.
دەنگ هەمیشە لە دوتوێی ماناو
دەلالەتەکانییەوە، دەسەڵاتی
خۆی پرۆسیسە دەکات، بەڵام
بێدەنگی لە ڕێگای جیابوونەوەی
لەو دەسەڵاتەوە فەزایەکی
داخراو بۆخۆی دەسازێنێت. ڕاستە
بێدەنگیەك هەیە دەبێتە کۆیلەی
دەنگ، واتە کاتێك دەنگ کۆمەڵێك
ڕێسا و یاسا دادەنێت، تەواوی
ڕەمزەکان بۆخۆی دەبات، لە
بەرامبەر ئەوەدا بێدەنگی ناوبراو
خۆی ئەوەندە بچووك نیشان
دەدات، کە جگە لە بەجێهێنانی
فەرمانەکان و ملکەچبوونی
فەرمانەکان ئیتر شتێکی دیکە
بە ئەرکی خۆی ڕەوا نابینێت، ئەو
بێدەنگییە نە توانای بیرکردنەوەی
هەیە، نە جیابوونەوە و دابڕان،
ئەو بێدەنگییە بێدەنگییەکی
نائامادەیە و هەمیشە دەکەوێتە
ژێر هەژموونی دەسەڵاتی
دەنگەوە.
بەڵام بێدەنگییەك هەیە، کە ڕووخسارە
مەزنەکەی خۆی لە نێرگزییەتە
کراوەکەیدا هەڵدەگرێتەوە، ئەو
بێدەنگییە ئەگەرچی لە بەرامبەر دەنگ،
کە دیار و کەشفکراوە، پێویستی بە
کەشفکردن هەیە، بەڵام هەمیشە دەبێتە
شوێنی وڕووژان، ئەو بێدەنگییە بەردەوام
پارێزگاری لە خودی خۆی دەکات،
هەمیشە ئامادەیی خۆی بۆ گوتن وەك
ڕووداو هەیە، ئەو بێدەنگییە جۆرێك لە
ئاگاییمان پێدەبەخشێت. بەو مانایەش
ئەگەرچی دەشێ نکۆڵی لە ئامادیی
بێدەنگی بکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا
ئاگاییەکە بە نێوماندا درێژ دەبێتەوەو
خۆی زیاد لە ڕوویەك «دەروونی،
سیاسی، کۆمەڵایەتی، تیۆلۆژی...هتد»
دەنەخشێنێت. قسەکردن
لە بێدەنگی، جۆرێکە لە
خۆ ڕووتکردنەوە، بەو
مانایەی کە بێدەنگی
لە دوتوێی خۆیدا
نێودژییەکی
داپۆشراوی
هەڵگرتووە،
پێویستی بە
کەشفکردنە،
بەڵام لە سەر

بنەمای لەیەك نزیكردنەوەی ئیرۆسیەتی «زمان-و رووداو».
كەواتە هەمیشە بێدەنگی مانای كشانەوە ناگەیەنێت، بە قەد ئەوەی جۆرێكە لە بیانووگرتن و نكۆڵیكردن و دژبوونەوە، بە دیووەكەی دیكەش ئیرۆسیەتی بێدەنگی وەك رووداو، كراوە و ئەكتیفە و نكۆڵی لە هەمووان دەكات، ئەو جۆرە لە بێدەنگی و وەستانە، نكۆڵیكردنە لە خۆ لەیەكخشانی سێكسییانەی دەم و وشە، واتە نكۆڵیكردنە لەو دەم قەڵەباڵغییەی كە لە تۆتۆلۆژییەتی دەنگەوە سەرچاوەی گرتووە. دەشێ تۆتۆلۆژیای دەسەڵاتی دەنگ پێمانبڵێت:- ئەوەی كە دەگوترێت، گرنگ نییە، ئەوەی كە دەشێ بگوترێت و دەسەڵات بە هەموو ماناكانییەوە سانسۆری دەكات، ئەوە گرنگە! هەر لەوێشەوە هیراركییەتی بێدەنگی دەسەڵاتی رەهای دەنگ دەبڕێت و جیاوازییەكانی خۆی وەك رووداو دادەمەزرێنێت. لەلایەكی دیكە بڕینی دەنگ و بەرجەستەكردنی جیاوازییەكان جۆرێك لە ترس دەخاتەوە، دەشێ ئەو جۆرەی ترس هەمیشە لە نێوان «وەستان وەك رووداو» و «تۆتۆلۆژیای دەنگ» خۆی بنوێنێ.

بە كورتی هەمیشە بێدەنگی لە نێو دژییەكی داپۆشراودایە، دەبێ لە رێگای هونەری كەشفكردنەوە قسەی لێبكەین، بێدەنگی دەشێ دڵەڕاوكێیەكی ئەكتیف بێ و بەرەو نێودژییەكی فرە رەهەند رابەرایەتیمان بكات؟! ئەگەر بێدەنگی لە نێودژییەكی داپۆشراوەوە بەرەو جوانی داپۆشراو هەنگاو بنێ، ئەوە ئەو بێدەنگییە لە پرسەوە سەرچاوە دەگرێ و لە گفتوگۆی كراوە و فرە رەهەند خۆی دادەمەزرێنێت، بەڵام ئەگەر جوانی بێدەنگیی هەوڵێك بێت بۆ بڕینی داخراو و رێگا پێنەدراوەكان، یان بە مانایەكی دیكە هەوڵێك بێت بۆ تەجاوزكردنی دەسەڵاتی چەسپاو، ئەوە خودی جوانی لێرەدا بە مانا "سارتەر»ییەكەی دەكەوێتەوە، واتە بەو مانایەی كە نێودژییەكی داپۆشراوە.
دواجار دەشێ لە توێی هەوڵە نەبڕاوەكان و بەدواداچوونە قوڵەكانی بیدەنگی و جوانی داپۆشراو بە مانا سارتەرییەكەی قسە لەو جوانیەش بكەین، كە بێدەنگی و سپێتی لاپەڕە دەیخاتەوە، ئەو جوانییەش هەمیشە لە نێو دژییەكی داپۆشراو دایە، یان بە مانایەكی دیكە ئەو جوانیە، جوانییەكی سیحرئامێزە و لە تێڕوانینی ورد و قوڵی خەیاڵدا دەبزوێ و دەگۆڕێ و بەرەو هەبوونی بێدەنگیمان دەكاتەوە، كە جاویدانییە، بەو مانایەش جوانی بێدەنگی یان داپۆشراو لەگەڵ پرسی داهێنەرانە یەك دەگرێتەوە.



تراژیدیای گەورە کارە
نابەجێکانی خەڵکە
خراپەکان نییە، بەڵکە
تراژیدیای گەورە بێدەنگی
کەسە باشەکانە.

مارتین لۆسەر کینگ



# شێرزاد حەسەن

لەوە دەچێت بەر لە تەقینەوەی یەکەم
گەردوون وەها چڕ بۆتەوە کە هەرچی
چڕ بووبێتەوە و پاشان تەقیوەتەوە و
لێکەوتۆتەوە، بەر لە بوون چی هەبووە؟
گەر کۆتاییەك هەبێت دوای کوژانەوەی
ئەستێرەکان لە دوای
کەمتر یان زیاتر، ئاخۆ
هەڵبەت خامۆشی.
بەر لەوەی من وتۆ لە
لە منداڵدانی دایکەدا
هەبووی؟ هەر خامۆشی.
کەم و زۆر: ئەو کاتەی

کە گوایە هەموو
هەیە لە ئەتۆمێکدا
بلیارەها ئەستێرەی
هەڵبەت خامۆشی.
هەر هەموو
بلیۆنەها ساڵ ،
چی بە دوادا دێت؟

دایك بین کە هێشتا
دەڵەمە بووین.. چی
دوای ساڵانێکی
بیرمان دەچێت



هەناسە بدەین یان هەر بە راستی
لە هەناسەدان بێزار دەبین؟ ئاخۆ
چی دەقەومێت؟ دیسانەوە خامۆشی..!
گەر رۆحی بوون و گەردوون
خۆشەویستی بێت، خۆشەویستی بۆ
خۆی بێجگە لە خامۆشی هیچی دیکە
نییە، هەرا و زەنا و دەنگەدەنگی زۆر
واتا نەمانی خۆشەویستی، هەر لەبەر
ئەوەشە کە خۆشەویستی دەکەوێتە
گیانەڵا و ئاوزینگدان، دونیا پڕ دەبێت
لە شەڕ وگێچەڵی نەبڕاوە، هەر
بۆیە ڕق و کینەبازی جەهەننەمی
جەنگەکان جۆش دەدات. خامۆشی
شۆڕبوونەوەیە بۆ قووڵترین پنت
لە رۆحی خۆتدا و دواندنی خۆتە
بە هەموو زمانەکان. خامۆشی
بێدارکردنەوەی هەر هەموو زمانە
زیندووەکان و مردووەکانی دونیایە.
بێ پەند و حیکمەت نیە کە
عیشقی قووڵ پتر هێور و هێدی
و خامۆشمان دەکات. شیعر بۆ
خۆی چییە بێجگە لە نووسینەوەی
خامۆشییەکی رەنگاو رەنگ و زیبا
کە پڕە لە راز و نیاز و مراز..! لەودیو
هەموو دەقە گەورەکانی دونیادا
خوێندنەوەی خامۆشییەکی پڕ مانا
خۆی شاردۆتەوە کە هۆشمەندی
گەرەکە بۆ بینینی، بۆ خوێندنەوەی
نەوتراوەکان و نەبیستراوەکان و
نەبینراوەکان. کە دەدوێین.. گرنگ ئەو
ڕستانە نین کە لەبەردەم ئەویدیکەدا
هەڵیدەڕێژین.. نەخێر.. هەموو
ماناکان و رازەکان وا لە ناوئاخنی ئەو
بۆشایی و خامۆشییەدا کە دەکەوێتە
نێوان وشەکان و رستەکان. جوانترین
پەرجووی یەزدان کتێبەکانی نین
کە یەك دوو دانەن، بەڵکو سروشتی
خامۆش و خەوتووە لەبەردەمی ئێمەدا.
چەنەبازی و هەڵەوەڕی بێ تام و زۆر
گەواهی نەبوونی خۆشەویستییە،
خۆ نواندن و نمایشی گاڵتەجاڕانە
هەژاییەکی کوشندەیە لە بێ میهری
و ونکردنی سۆز و خۆشەویستی.
خۆشەویستی و خامۆشی دووانەی
هەمان سکن، خۆشەویستی لە قاڕی
بازار چ دەکات؟ هیچ..!
خۆشەویستی لە گوێ
چەم و ڕووبار و
دەریاکاندا..
لە قووڵایی
دارستان و
جەنگەڵەکاندا
ڕاوی
خامۆشی
دەکات..
لەسەر



ترۆپکی شاخەکاندا یان ئەشکەوتەکاندا.
لەگەڵ یاردا چ پێویستت بە غەڵبە غەڵبە.. ئەی چاوەکان کوێراییان داهاتووە؟ کە خۆشەویستی میوانی دڵ بێت، خامۆشی وەك خانەخوێماڵی رۆح دەڕازێنێتەوە. ئاخۆ تۆ قەت بیستووتە کە گەورەترین میلۆدی لە خودی مۆسیقاکە وا لە نێو ئەو بڕگە و ناوبڕە خامۆشەدایە نەك سەدا و ئاوازەکە.. مۆسیقای بێدەنگی. تۆ تەنها زارت ناسیوە بۆ پەیوەندی.. زمان گێڕان.. لێو بزواندن.. کەواتە هیچت لەسەر راکێشانی ئەو پردە نەزانیوە کە ئاسن و چیمەنتۆی ناوێت، ئەو کاتەیە کە گیانی بە گیانی دڵمان بەر دڵی ئەوانی دیکە دەکەوێت.. وەها بەریەککەوتنێکە کە ئاگر و رۆشنایی لەگەڵ خۆی دەهێنێت. زمان چەندە بگەڕێت گوزارشتە لە شکستی ماناو تەقەللای دەربڕین، زمان بۆیە هەیە تاوەکو شتێك بشارێتەوە لە ناو پێچ و لوولی دەمەتەقێدا کە هی ئەوە نیە بوترێت، زمان بۆ هەمیشە دەمامکی دووەمی سەر رووخسارە کە بە هەردووکیان تۆ لە من و من لە تۆ دەشارنەوە. ئەرێ بە ڕاست هەر بە تەنها ئامادە بوونمان لەبەردەم یەکدیدا بەس نییە بۆ ئەوەی بەو هەموو شێوازە نازارەکییەی هەمانە بە یەکدی بگەین، ئامادە و خامۆش. خۆ ملیۆنەها ساڵ مرۆڤ ئەو زار و زمانەی هەنووکەی نەبووە و پەکی نەکەوتووە، سەما زمان بووە.. نیگا و فرمێسك و خەنین.. ئاماژەکانی جەستە..وێنەکێشان و نمایش...هتد. ڕامان و چوونە خەڵوەت وەرزشێکە بگەیتەوە بە خۆت.. گەشتێکی دوور و درێژە بە ناو خۆتدا بە مەرجی خامۆشی.. هەر ئەم مەشقەش بووە کە پەیامبەر و سۆفییەکانی گەیاندووە بەو هەقیقەتەی کە بۆی گەڕاون، دوا جار شاگەشکە بوون بەوەی بە نووری ئیلاهی گەیشتوون، بەڵام  لە ناو قووڵایی خامۆشی و ڕاماندا گەیشتوونەتەوە بە خۆیان کە گەیشتن بووە بە رۆحی باڵای ئەم گەردوونە .. بە نهێنی خەلیقەت..! خامۆشییەك وا لە ناو خۆت و ئەم گەردوونەدا.. بیبینە و هەستی پێبکە.. تامی بکە.. بۆنی بکە.. زاووزێی لەگەڵدا بکە.. نیشتەجێی تۆیە و نەتناسیوە.. تۆ میوان و نیشتەجێی بە.. وەلێ ئەفسووس کە هەر هەمووومان لە خامۆشی دەترسین.. هەر لەبەر ئەوەشە بۆ هەمیشە بە دوای قەڵەبالغیدا دەگەڕێین.. چەندە پتر نوقمی ئەو عەزازیڵ و حەشاماتە دەبین.. ئەوەندە پتر لە خۆمان و دونیا ون و وێڵ دەبین..!





# ئەنوەر ڕەشید عەولا

تێڕامان لە بێدەنگی یەکێکە لەو حاڵەت
و پرسیارە ئۆنتۆلۆژییەی لەوەتەی مرۆڤ
هەیە، ئەم غایلەیەشی بە دوای خۆیدا
هێناوە. لەبەر ئەوەی بێ جیاوازی، بێدەنگی
ڕێگەیەکە و لەبەرە بەرەو خۆ دواندنێکی تر.
هەقیقەتێکە لە پاڵ هەقیقەتەکانی تردا.
بۆیە هەریەك بە جۆرێك ئەو ڕێگەیە تەی
دەکات و ڕۆیشتووە و دەڕوات و حیکایەتی خۆی
هەیە بۆ گێڕانەوە.
بێدەنگیش نیشانی داوین، وەکو ژیان ناچوون یەکە و

زیاد لە روویەکی هەیە!
بێدەنگی هەیە، لە پاکێتیەکی شاراوە و نائاشنا، لەو بێدەنگیانەیە مرۆڤ لەگەڵ خۆی دا ئاشت دەکاتەوە، لە خۆیی نزیکتر دەکاتەوە.
ئەو کەسە بێدەنگەی لەگەڵ خۆیدا ئاشت بووەتەوە و هەست بە سەلواو نزیکی لە هزر و هەست و جەستە و دەروونی دەکات، بە هەموو هیلاکییەکەوە بە دەست خوارو خێچیەکانی ژیانیشەوە، لەگەڵ خۆیدا خۆش دەگوزەرێنێ.. لەگەڵ ئەوانی تریش دا دڵ خۆش و رووخۆش و کراوەیەکی دڵ ئاوەدانە.
چونکە هەرچیەکی لێ روودەدات، هەموو شتێك تێك و پێك نادات، بەڵکو بە خۆی دەڵێت.. ئەوە ئاراستەکانی من وەها بوون، دەبوو ئەوانەشم لێ بەسەر بێت، کە بەرسەرمدا هاتوون و دێن! چونکە ژیان بۆ من ئەوەیە، بۆیە کردومە و دەیکەم، ئەمە رازپارێزی و لە خود رامانێکە.
ئەو بێدەنگییە یە خۆی پەردەپۆش دەکات لە دەرەوە، بەڵام بێ پەردە لەگەڵ خۆیدا دەکەوێتە گفتوگۆوە، خۆی سەرکوت ناکات خۆی ناخواتەوە و



ناکرۆژی بەڵکو بۆ خۆی و دواتر زیاد لە مانایەك بەسەر دەرەوەدا، خۆی ئاوەڵا دەکاتەوە!
واتا بێدەنگییەك؛ ئاوس بە کۆمەڵێ ئەگەر......

بەڵام بێدەنگی یەکی تر هەست پێ دەکرێ، لە» پۆخڵیەکی شاراوە» بە سروشتێکی قیرسیچمەییانەوە، کە دواجار ئەو خودەی خۆی بۆ کەشف ناکرێت و دەستەبەر ناکرێت، خۆی دەتۆرێنێت لە هەموو شت!
بەر لە هەرکەس ئەو بێدەنگییە لەگەڵ خۆی دا تۆراوە. رموزن و بوغزایی و نەفرەت رژێن.. و بەدگومان لە سێبەرەکانی خۆیشی . بە هۆ و بێ هۆ سەرکۆنەی هەموو هێزێك دەکات، هێزی ناوەوەی خۆی نەبێت!
ئەمە لە جۆری دیکتاتۆرەکانن... سەرکەوتنەکان تەنها خۆی ئەندازیارێتی و
ئۆباڵی هەموو وردبوون و تراژیدیاکانی بوونی خۆیشی، دەخاتە ئەستۆی دەرەوە. ئەم خودە زیاتر سەرزەنشتکەر و نەفرەت بارێن و تۆڵەسێنە...
گەرچی بێباکە بەڵام نەبەرد نییە نە لەگەڵ پاکێتی خۆی نە بۆ خەڵکی تریش!!

بێدەنگی نهێنی و رەمزی رۆحانیەت و عیرفان و جوانناسیانەشی لە خۆی دا هەڵگرتووە، بە وێنەی باشۆ و نانۆساکاکی و مەولانا و سهروەردی و مەحوی و ئۆشۆ و بودا لە بێدەنگیدا چێژی رۆحی گەیاندویەتی بە ئیستشراقی رۆحی خۆی و ئەودیو خۆی ..!



بەر جۆرێکی تر لە  بێدەنگی دەکەوین کە لای خۆشمان دەتوانین ئاماژەی بۆ بکەین،
هەڵبەت لە بواری رۆشنبیریدا  دەنگی جۆراو جۆر هەمیشە بیستراوە، بەسەر کۆمەڵێ رایەڵ و پنتدا.. خۆیان پەخش کردۆتەوە و دەکەن، بەڵام پڕ بوون لە هیچ نەوتن!
کەچی مامۆستا هەردی تەنها بە دیوانێکەوە دێت و ئەوجا بێدەنگ دەبێت..
داخوا ئەزمونەکەی پێی گوتووە ئیتر بێدەنگی هەڵبژێری خراپ نییە. بۆیە ئەو بێدەنگییە نەیکردە ئەوەی خاوەنی بەخشش و دەنگی خۆی نەبێ لە بواری ئەدەبیدا...؟
 محەممەد عومەر عوسمانیش هەروەسا لە غوربەتا دێت و ئیتر دوای ئەوە بێدەنگ دەبێت، داخوا ئەزمونی شیعری  ئەوەی لێ خواست.. نازانین؟ بەڵام ئەوە دیارە» لە غوربەتا» داخوا دەنگێکی تایبەت نەبوو وەك خەسڵەتی خۆی...؟ گەر وا نەبا.. چۆن سیحری خۆی بڵاو دەکردەوە بە ناو یادوەریی شیعری ئێمەدا........؟

تۆ بڵێی بێدەنگی، درەنگ وەختانە دانیشتن بێ بە دیار وردبوون و برین و شکستەکانی خۆتەوە.. و لێگەڕانیان بێ هەتا بزانین کە بەرەو چ ناگەهانێکی ترمان دەبەن....؟ گەر بەهای، ئەو واتا و دەلالەت و هێمایانەی لێ بکەینەوە
 بێدەنگی منی عارف.. منی سیاسی.. منی نووسەر.. منی کۆمەڵایەتی.. منی جەنگاوەر.. منی عاشق
لە چیدا لە یەك دەچن و لە چیدا لە یەکتر جودا دەبنەوە، نەدەهاتە گۆڕێ!؟
 داخوا ئێمەی مرۆڤ چەند پێویستیمان بەم پۆلین کردنانە هەیە و دەتوانین بگەین بە بنەچەی چی و لەوێوە چی لەسەر بونیاد بنێین...لە کاتێکدا گوتراوە و دەگوترێتەوە، پوختەیی و کامڵی، هەرگیز بونی نەبووە و نابێ!

که دەچینەوە سەر مانا و دەلالەت و بەهاکان « بێدەنگی توێکاری» ئەکەین؟! هەتاوەکو لەو لوغزە تیبگەین کە بێدەنگی لەگەڵ خۆی دا هەڵی گرتووە و دەیگێڕێ؟ بۆچی بێدەنگی یەك هەیە رێکردنێکە بە تاك و تەنیا، چونکە چیتر هەست بە هاودەمی .. هاوسۆزی.. هاوڕێی.. دڵ نەوایی ئەویتر ناکەین.. و دەمانەوێ بەس خۆمان تاڵی و تفتیەکانی ژیان بیچێژین؟!

یاخود بێدەنگی ئەو دەم ساتەی « دیالۆگێکی رۆحی یە» کە بە لە خۆڕاپەرمونێکەوە دەڵێت: « ئەوە رێگەی منە، ئەی رێگەی تۆ کامەیە»؟ بێدەنگی هەڵبژاردنی رێگەیەکە یاخود کوێربوونەوەی هەموو رێگاکانە؟!

داخوا دەتوانین بڵێین بێدەنگی دیوەکەی تر و هاوشانی بوونی تەنیاییە، واتا تەنیایی خۆیەتی وەك دوا سنوور خۆی درێژ دەکاتەوە..؟! داخوا بێدەنگی قۆزاخەیە، بۆ دنیای خەیاڵ...؟ واتا لە بێدەنگی دا خەیاڵ جەم دەبێتەوە.. لە دەنگ دا پەرش دەبێتەوە..؟ دەبێ بێدەنگیش وەك هەقیقەتێك لە ریز هەقیقەتەکانی تر چاو لێبکەین و بناسین..؟

کە هەبویەکە لە بووندا..؟ بێدەنگی لە خودا دەچێت؛ بێدەنگ بێدەنگ.. بوون پڕ دەکات لە خۆی! هەر بەتاڵی دەکەنەوە و تازە بە تازە پڕ دەبێتەوە، هەر دەیمرێنن و لە دایك دەبێتەوە!!

بێدەنگی و خودا دەڵێی ئاوەڵدوانەی نێو رەحمێکن. رەحمێك لە نهێنی پەنهانیەتەکان؟!

ناوسکی دایك بێدەنگی.. نێو گۆڕیش هەر بێدەنگی، وەك بڵێی مردن و زەیندەگی لە جەوهەردا یەك شت بن؟!

داخوا ماکی بێدەنگی.. ماکی چاوەڕوانی.. ماکی تەنیایی.. ماکی ژیان.. ماکی مرۆڤ، بە تەنیا و بێ ئەویتر ئەتوانێ بەرجەستە ببێت..؟ یانەخۆ هەمویان دەڕژێنە ناو یەکترەوە و کار لەسەر یەکتر کردنیان دەبێتە سەنگی مەحەك و پێوەری بوونی خۆیان بەوە دەسەلمێننەوە..؟

داخوا لە ئێرادا، دەتوانین لە هارۆکی مۆراکامی روخسەت بخوازین و بە بێدەنگی بڵێین.. بە یارە تاقانەکەی رۆح بڵێین. بە هاژەو لرفەی ژیان بڵێین.. بە تۆنی نەرمی تەنیایی بڵێین.. بە خوڕە خووڕ و مرخەمرخی خولیاکان و هەستی پڕ سروتمان «ئەگەر تۆ منت لە یاد بێت، ئیتر بەلامەوە گرنگ نییە، هەمووان منیان بیرچوبێتەوە».

گەر بێدەنگی زارۆڵەی تەنیاییەکی قوڵ و.. غەرییەکی قوڵ و.. هەستیارییەکی قوڵەوە بێت، ئەوکات بێدەنگی وەك هەبوویەك بە هەست کردن بە جیاوازییەکانیدا، سەنگینی و ماهیەتەکەی دەناسینەوە..؟





هەست کردن بە میلۆدیای نەبیستراوی ئاوازە جوداکان لە
ئەفسوون و بێدەنگی دا، چ تەلیسمێکە..؟
من هەنووکە ئەو وێڵگەردەم........ هاوڕێ
تەنیاییم ڕێگا.. و خەیاڵم ڕێ نما.. بە توێشەبەرەی
وەهم گەلێکەوە، سەر گەردان سەرگەردان «دەگەڕێم
بە نیشتمانەکانی سەراب دا» سەرابەکانی ناو سەری
خۆم!

دانا ڕەئوف

# لاش نۆڕێن لە شەوێکی فەلسەفیدا

٩٣

LARS NORÉN FILOSOFINS NATT

ALBERT BONNIERS FÖRLAG

شانۆنامە نووسی سویدی «لاش نۆرێن» لە دایك بووی ساڵی ١٩٤٤، لەسەرەتادا بە شیعر دەست پێ دەکات و لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا یەکەم دیوانە شیعری خۆی «لەیلاك، بەفر» بڵاودەکاتەوە. دواتر چەند دیوانێکی تر و ڕۆمان دەنووسێت، شیعر و پەخشان تێکەڵاو دەکات و دونیایەکی ڕەش، یادەوەری و پەرۆشی بۆ شتێکی نادیار، ناوەڕۆکی ڕۆمان و شیعرەکانی ئەوکاتەی پێك دەهێنن. بەڵام ئەم شاعیرە لە دوای چەند دیوانێك شیعرەکانی زیاتر و زیاتر دەچنەوە یەك و کورت و چڕ دەبنەوە، وێنە شیعرییەکانی لە فۆرمی زمانێکی داماڵراودا، دەبنە تەنها ترووسکەیەك و وشەکان لە جەستەیەکی بزر بوودا دێن و دەچن. ئەم ڕەوشە، نۆرێن لە جیهانی شیعر، لە زمانە لیریکییەکەی، لە گەمەی وشە و وێنەکان دوور دەخاتەوە، لە هەمانکاتدا تووشی دڵەڕاوکێ و نائارامیی دەکات. شیعرەکان دەبنە هەڵم و لە نێو ڕووپەڕە سپییەکاندا بە تەواوی دەتوێنەوە، شاعیریش لە پڕۆسەیەکی کردەیی و داهێنانێکی ئەدەبی و



هەستی شاعیرێکی ڕەشبینندا هەست بە پووکانەوەی وشەکانی و بزربوونی جیهانە شیعرییەکەی خۆی دەکات. ئەم شاعیرە زۆر لە خۆی ناکات، شیعری لاواز و بێ ڕەنگ و بۆ نانووسێت و قەڵەمەکەی، کە ڕۆمان و شیعری پێ دەنووسی دادەنێت و لە بری ئەوە ڕوو دەکاتە دونیای شانۆ و نووسینی شانۆنامە. کە دەستیش دەکات بە نووسینی شانۆنامەکانی، دیدە چڕەکەی، وشە زبرەکانی، شیعرییەتی نووسینەکانی و زمانە شیعرییەکەی، ئەتمۆسفێرە ڕەش و سترکتورە ئەدەبییەکەی سەرلەنوێ لە ناو شانۆنامەکانیدا دەدۆزێتەوە. نۆرێن لەم بارەیەوە دەڵێت: «شیعر و دراما دوورن لە یەکترەوە، ئەمەش بۆ من مەسەلەیەکی گران و پارچە پارچە بووە. من بڕیاری خۆمم دا، کە شانۆیشم هەڵبژارد لەبەر ئەوە بوو، کە شیعرەکانم کورت و کورت دەبوونەوە،



تا وای لێ هات بە تەواوی بزر بوون. شیعرەکانم هێندە بچووك بوونەوە، لە کۆتاییدا بوونە پارچە ئێسقانی بچووك.»

ئێستا دوای ئەم هەموو ساڵە، دوای سەرکەوتنە گەورەکانی لە بواری نووسینی شانۆیدا، قەسیدەیەکی درێژ بە ناوی «شەوی فەیلەسوف» لە دوو توێی کتێبێکی ١٩٠ لاپەڕەیدا بڵاودەکاتەوە. بەرگی کتێبەکە، لەبری وێنە و نەخشەسازی، دەمووچاوێکی دەمامکئاسای نۆرێنە، کە بە گەچ دروست کراوە. سیمای وەك مردوویەك لە نێو گەچە سپییەکەی بەرگی کتێبەکەدا، بە تەنکی دیارە. ئەم سیمایە و بەو شێوەیە، لە بری جەستەیەکی دیارنەماو، دەبێتە دەمامکێکی مردوو؛ دەمووچاوە سپییەکە، گەچە بەکارهێنراوەکە، ناوینشانی دیوانەکە «شەوی فەیلەسوف» دەروازەیەکی فراوان بۆ خوێندنەوەی دیوانەکە دەکاتەوە.

خوێنەر لە سیما لە گەچ گیراوەکەی نووسەرەوە و لە ڕەنگی مەرگەوە، دەچێتە ناو کتێبەکەوە و ڕاستەوخۆ، ڕووبەڕووی هەزارەها «من» دەبێتەوە، کە پێکەوە، بە کۆرس، یەکە یەکە و بەتەنها وەك مەنەلۆگێکی ناوەکی دەپەیڤن. ئەم قەسیدە درێژە ئاخافتنێکی چڕ و هەمەلایەنە لەگەڵ «من»ی نووسەردا، کە لە دەروازەی یادەوەرییەکاندا دەردەکەون و دەبێتە هەزارەها «من». ئەم «من»انە چەندە لە یادەوەرییەکاندا دەژین، هێندەش لە ئێستادا ئامادەبوونێکی مەجازی بەهێزییان هەیە. «من»ەکان بە

شێوەیەك لە شێوەكان مردوون،
زیندوو دەبنەوە و دەبن بە
كەسانێكی تر و هەمیشە
لە زیادبوون و تێكەڵاوبوون
دان. یەكەم دێڕەكانی ئەم
قەسیدەیەش، لە سەفەری
«من»ەكاندا بەم شێوەیە دەست
پێ دەكات:
من نازانم، من نازانم لە كوێم
بەڵام من ئێستا سەفەر دەكەم،
چیتر نازانم بەرەو كوێ
خامۆش و تاریك نییە، دەمێكە
خامۆش نییە
خامۆش و بێ دەنگ./.../
هەندێك جار دەقەكە دەبێتە
شانۆ و لە ڕەوشێكدا دەوەستێت،
دەیەوێت سەرلەنوێ دەست
پێ بكاتەوە، بەڵام زمانی
دەگیرێت و وشەكان لە نێو
دەنگ و ئاماژەكاندا دیار نامێنن،
لە نێو تەمومژی دونیایەكی
تردا، لە بەرەبەیانێكی سپیدا،
لە ئۆقیانووسێكی ترەوە
دەردەكەونەوە و دەنگی
«من»ەكان بۆ تاوێك بەسەر
هەموو شتێكدا زاڵ دەبن.
«من»ەكان باسی مەرگ لە ژیاندا
دەكەن، بەڵام خۆیان نایانەوێت
بمرن، لەبری ئەوە سەرنجی تەماشاكەران، چاوی مردووەكان و هەستی زیندووەكان بەلای خۆیاندا ڕادەكێشن: «تەماشای من بكەن، تەماشای مەرگی من و زیندووبوونەوەم بكەن». لە لایەكی ترەوە «من»ێكی تر هاوار دەكات و دەڵێت: ئەی من، تەماشای من بكەن. «من»ەكان هەر وەك ئەكتەری سەر شانۆكان، كارەكتەری ناو شانۆنامەكان، پاڵەوانی ناو ڕۆمانەكان و فیگوری داستان و میتۆلۆژییەكان بە بەردەوامی دەمرن و زیندوو دەبنەوە. لە كۆتایشدا، دوای ماڵئاواییكردن، پێكەوە دەمرنەوە یان دەچنەوە جەستەی نووسەر و لە سیما لە گەچ گیراوەكەیدا خۆیان دەشارنەوە. هەندێك جار ئەم «من»انە لە بێدەنگیەكی مەنگدا، لە ئاوێكی وەستاودا، لە وچانێكی كورتدا، لە دیمەنێكی تەواو نەكراوی دوا شانۆنامەییەكدا، لە گۆرانییەكی خەمناكی بێ مۆسیقادا، لە پێدەشتێكی پڕ لە دڕك و داڵدا دایكیان دەدۆزنەوە. دایك مردووە یان ئەو بەشەی، كە ماوە و هێشتا نەمردووە، هێدی هێدی لە زەمەنێكی تێكشكاوی نادیار و ڕەهادا یان لە زەمەنێكی فیزیكیدا دەمرێتەوە و ماڵئاوایی لە «من»ەكان دەكات.
/.../ یەكەم جار سەرلەنوێ لە دایك بوونەوە
واتە هەمدیس لە گوناە پاكبوونەوە و پاشان
لە كۆتاییدا مردن.
گوتم مردن.
من لەو وشەیە ئازاد نیم
گۆی دەكەم و لیك بە
لالێومدا دێتە خوار
دەزانم. گۆی دەكەم و دەمم
ئاو دەكا
دەزانم، دەبێ بزانم، دەبێ



بزانم
بڵێم، دایکم هەمدیس دەمرێتەوە
ئەوەی لە دایکم ماوەتەوە، هەمدیس دەمرێ
ئاە، زۆر دەمێکە.

ئەم شەوە فەلسەفییە سەرگوزشتەیەکە لەو شوێنەوە دەست پێ دەکات، کە تەواو دەبێت. مەرگیش ژیانی هەموو پیت و وشەیەکی ئەم کتێبەیە، مەنەلۆژێکە بەر لە هەموو کەسێك و هەموو شتێك خۆی دەخوات و مەرگی خۆی لە یادەوەرییەکان و لە ئێستا و لە ڕیتمی وشەکاندا بەرجەستە دەکات. لەم شەوە فەلسەفییەدا، ئەزموونی دەنگێك بە نێو ڕاڕەوەکانی یادەوەرییدا، ژیانی ڕۆژانە و شتە ڕووکەشەکاندا دەڕوات و «من»ەکان دەخاتە ناو ڕەوشی شەوە درێژ و قووڵ و تاریکەکانی خودی خۆمانەوە. ئەم دەنگانە پارچە پارچە دەبن و دەبنە چەندین کارەکتەر و رۆڵی جیاواز و فرەمانا دەگێڕن، لەگەڵ یەکتردا دەکەونە دیالۆگێکی فەلسەفییانەوە و تێکەڵاوی تێکستەکە دەبنەوە، هەندێك جاریش بە تەواوی لەیەکتری دەترازێن. بەڵام لە زۆربەی دونیای «من»ەکاندا، لیریکە شیعرییەکە دەبێتەوە بە دراما و بە چواردەوری «من»ەکاندا دەسوڕێنەوە و لە دیمەنی کورت کورتدا دەردەکەونەوە.

نۆرێن لە یەکەم ڕستەی یەکەم دێڕی لاپەڕەی یەکەم، کە لە سەرەتای ڕستەوە دەست پێ دەکات، دواتر سەرەتای هیچ ڕستەیەکی تر ناچێتەوە سەرەتای دێڕێکی ترەوە، بەڵکو سەرەتای هەموو ڕستەیەك لە ناوەڕاست یان کۆتایی ڕستەیەکی تردا دەست پێ دەکاتەوە. بەمەیش سەفەری «من»ەکان ڕێچکەیەکی تیژڕەوانە لە خۆدەگرێت و لە هیچ وێستگەیەك، بۆ هیچ «من»ێکی تر ڕاناوەستێت. نۆرێن زمان دەکات بە ئامرازێکی دەسەڵات و لە هەمانکاتیشدا بەندیخانە بۆ تەقەلای «من»ەکانی ئەمڕۆی ئەوروپا، بۆ لە دایکبوونێکی ناشەرعی و مردنێکی ناشایستە و جەستەیەکی بێلانە. ئەم زمانە لەم شەوە فەلسەفییەدا دەبێتە زمانی پەیڤ و گفتوگۆی زیندووەکان لە زەمەنێکی تردا، زەمەنی بەستەڵەك و زەمەنی مردنی هەتاهەتایی. ئەمە زەمەنی هروژمی وشە و وێنە و مەجاز و هێماگەلەکانە، هروژمی مەرگ و ژیانە و وەکوو تەونی جاڵجاڵۆکە، لە وێنەکان، لە ریتم و چڕی شەپۆلەکاندا ژیانی داوەتە دەست مەرگ، هەرچۆن مەرگیشی داوەتە دەست ژیان.



ئەمە ژیانە، لەهەمانکاتدا دونیای مەرگ و ئامادەگی مەرگە. چەندە ئەم قەسیدەیە دەخوێنیتەوە، چەندە لە لاپەرەکانی دوایی و وێستگەکانی کۆتایی نزیك دەبیتەوە، هێندەیش بەتاڵ دەبیتەوە. وشە و وێنەکان بە هەنگاوی گەورە بۆ دواوە، بەرەو پێشەوە دەڕۆن. ئەم شەوە فەلسەفییە، بە زمانێکی چڕ چنراوە، چڕی لە وشە و وێنە و مەرگی «من»ەکاندا.
وێنەکان لە جوڵەیەکی بەردەوامدان، ڕەوشەکان دووبارە دەبنەوە، وشەکان سەرلەنوێ دەوترێنەوە و دەنگەکانیش «من»ەکان ڕیز دەکەنەوە و لە چیرۆکێکی تردا دەست پێ دەکەنەوە. لەدوا لاپەڕەکانیشدا «من»ەکان دەبنەوە بە کارەکتەری شانۆنامەکانی نۆرێن و بەشێوەیەکی ئاسان و ساکار خۆیان ئەدەن بە دەستەوە. دەبنە کۆمەڵێك جوڵە و بەریتمێکی مۆسیقی دەجوڵێنەوە، سەما دەکەن و دەکەون و هەڵدەکشێن و دادەکشێن. ئەم «من»انە نە لە هیچ شوێنێك دان و نە هیچ مێژوویەکیان هەیە و نە سەر بە هیچ زەمەنێکیشن، چەندین پرسیار لەناویاندا دێن و دەچن، بەبێ ئەوەی هیچ وەڵامێك لە دەروازەکانی ئەم شەوە درێژە فەلسەفەییەوە، نە دەست «من»ەکان بکەوێتەوە و نە خوێنەریش هیچ وەڵامێك بدۆزێتەوە. ئەم قەسیدەیە، کۆی شانۆنامەکانی ئەم چل ساڵەی نۆرێنە و لێرەدا، لە ئەفسونی وشە و چڕی وێنەکاندا لەت و پەت بوون، پریشکی دیمەن و ڕووداوەکان و پارچەی کارەکتەرەکانە و لە «من»ەکاندا ڕەنگیان داوەتەوە و لە مەملەکەتی مەرگدا بەرجەستەی کردوون و سەرلەنوێ بوونەتەوە بە شانۆنامە یان داستانێکی مۆدێرن و شەوێکی درێژی فەلسەفی.
نۆرێن لەم قەسیدە درێژەدا خوێنەرەکانی بە وێنە و چیرۆکە پڕ لە ڕازو نهێنییەکانی ڕاو دەنێت، چەندە تراجیدیایە، هێندەیش کۆمیدیایە، چەندە فەلسەفەیە، هێندەیش چیرۆکێکی ساکاری ژیانی ڕۆژانەیە: دایکێك لە پەنای سێبەری کچەکەیدا هاوار دەکات، بەبێ ئەوەی خۆی هەست بە هاوارەکەی خۆی بکات. باوکێك، کە لەسەر قەرەوێڵەکەیەوە بە دەما دەکەوێتە خوارەوە، لە زەوییەکەدا بزر دەبێت، دەتوێتەوە و دیار نامێنێت. «من»ی چاودێر، کە لە شوێنە نادیار و تاریکەکاندا خۆی مەڵاس داوە، کەسانی سێبەرئاسا و مردووەکان تەراتێنی تیادا دەکەن. سەگێك بەرامبەر بە ماشێنێکی کۆن و فرێدراو، لە ناوەڕاستی بیابانێکدا هەڵتروشکاوە و بە بەردەوامی دەوەڕێت، لەبەر ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان مرۆڤێکی زیندوو لەو ماشێنەدا دانیشتووە.



دایك و باوكەكانی ئەم چل ساڵەی شانۆنامەكانی نۆرێن، لە شەڕێكی بێ كۆتایی وەچەكاندا، لە هەرەسهێنانی بنەماكانی خێزاندا، بە سیمای دەمامكئاساوە دەستەو یەخەی «من»ەكان دەبنەوە و بەدوای پێناسێكی تردا دەگەڕێن.

ئەم قەسیدە درێژە لە رۆحی ساموئیل بێكێت نزیك دەبێتەوە. «من»ەكان لە وشە و وێنە و وچان و بێدەنگییەكانی بێكێت و زمانە فەلسەفییەكەی ئەودا دەژین، كە بزریش دەبن هەر لە دونیا پڕ لە ڕاز و نهێنییەكەی بێكێتدا خۆیان دەشارنەوە. نۆرێن لەم تێكستەیدا، بە چەشنی بێكێت كاری لەسەر مەودا دوور و نزیكەكانی زەمەن كردووە. زەمەنێكی فەلسەفی؛ زەمەنێك بۆ «من»ە زیندووەكان و زەمەنێكیش بۆ «من»ە مردووەكان. ئەم زەمەنەی نۆرێن زەمەنێكی شلە و فۆرمی هەموو دەفرەكان وەردەگرێت و بە ئاسانیش لە پانتاییە بۆشە ناكۆتاكاندا بڵاودەبێتەوە.

نۆرێن لەم قەسیدە فەلسەفییە درێژەیدا، دەیەوێت بڵێت، كە من مردم لە كوێ بژیم.



من بۆ ئاگاداریی خۆم لە دنیای رۆمان و چیرۆك، خووی گەڕانم هەیە بەدوای هەواڵی چاپکردنی رۆمان و کۆمەڵە چیرۆکی نوێدا، ئەگەر بەزمانێکیش بن، کە نەتوانم بیانخوێنمەوە، یاخود دەستم پێیان نەگات، ئەوا حەزدەکەم لەبارەیانەوە بخوێنمەوە. ئەمەش وا دەکات کەمێك ئاگاداری هەندێك کتێب بم، کە دەستم پێیان ناگات و کۆمەکیشم دەکات تا کاتێك رێمکەوتە لای ئەو کتێبانە، پێشوەخت وێنایەکم هەبێت لەسەریان.

رەفیق شامی یەکێك بوو لەو رۆماننوسانە، کە پێش بەدەستخستنی کتێبەکانی، وێنایەکم هەبوو بۆی. بەوەی پێش راپەڕینی خەڵکی سوریا بە ڕووی رژێمەکەی بەشار ئەسەددا، لە رێگای هەندێك چاوپێکەوتن و وتار و هەواڵەوە، ناوی رەفیق شامیم بیستبوو. دەمزانی ئەو رۆماننوسێکی مەسیحی/سورییە و بە ئەڵمانی دەنوسێت. بەڵام هیچیم نەخوێندبووەوە. دیارە تا ئێستاش ئەوەندەی من ئاگاداربم، لەو کتێبە زۆرانەی نووسیونی، هەر لە چیرۆکی منداڵانەوە بۆ رۆمان و شانۆگەری و وتار و چیرۆك، تەنها چوار کتێبی کراوە بە عەرەبی. کەچی لەگەڵ دەستپێکردنی



شۆڕشی سوریادا، ڕەفیق شامی لە ڕێگای وتارەکانییەوە، زیاتر بەدەرکەوت لە دنیای عەرەبیدا. ئەگەرچی من وا هەستدەکەم ئەو نووسەرە سەر بەو تەرزە لە بیرکردنەوە بێت، کە بەناوی خۆشەویستییەوە باوەڕیان بە یەک پارچەیی خاکی وڵات هەیە، چ سوریا، عێراق یاخود ئێران و تورکیا و... بەڵام ئێستا کە سەرقاڵی ئەم نووسینەم، جگە لە هەندێك چاوپێکەوتن و وتاری سەبارەت بە ئەدەب بەگشتی و سوریا و ئەو گۆڕانکاریانەی لەوێ ڕوودەدەن، توانیومە سێ کتێبی بخوێنمەوە: یەکێکیان چیرۆکە بۆ منداڵان و دوانەکەی تریشی ڕۆمانن.

دەبێت ئەوە بڵێم ڕەفیق شامی، نووسەرێکی پڕ بەرهەمە و کتێبگەلێکی زۆری هەن، کە ناتوانم ئەزمونی ئەو، لەو سێ کتێبەیەوە نیشان بدەم. هەربۆیە دەمەوێت کەمێك لەو دوو ڕۆمانەی بدوێم و باس لە فەزای کارەکانی بکەم.

بەکورتی ڕەفیق شامی ناوە ڕاستەقینەکەی «سهیل فازل»ەو پێدەچێت لە پەیوەستبوونی زۆرییەوە بە فەزای شامەوە وەك لە ڕۆمانەکانیدا بەدەردەکەوێت، نازناوی خۆی گۆڕیبێت بۆ «شامی» ساڵی ١٩٤٦ لە دیمەشق لەدایك بووە. ساڵی ١٩٦٥ لە گەڕەکەکەیان بڵاوکراوەیەکی دیوار دادەمەزرێنێت و تا ساڵی ١٩٧٠ دەریدەکات. لە ١٩٧١دا سەفەری ئەڵمانیا دەکات و بەدەم ئیشکردنەوە دەخوێنێت، تا ساڵی ١٩٧٩ دکتۆرا لە کیمیای ئۆرگانیدا بەدەستدەهێنێت. لە ساڵی ١٩٨٠دا، لە کارگەیەکی گەورەی دەرمان کاردەکات، لە ساڵی ١٩٨٢دا دەست لەکار دەکێشێتەوە تا خۆی بۆ ئەدەب تەرخان بکات. لە ساڵی ١٩٨٠داو لەگەڵ چەند نوسەرێکی بێگانەی تردا، گۆڤاری «بای باشور» دادەمەزرێنێت.

ناوی هەندیك لە ڕۆمانەکانی ڕەفیق شامی، نەوەك هەموویان: حیکایەتخوانی شەو ١٩٨٩، کە دوای بیست ساڵ کرا بە عەرەبی. ڕاپۆرتی نهێنی لە بارەی گۆتەی شاعیرەوە ١٩٩٩، کۆچ لە نێوان شەوو بەیانیدا ١٩٩٥، دەستێك پڕ لە ئەستێرە، درۆزنی ڕاستگۆ، ڕوی تاریکی خۆشەویستی و نهێنییەکانی خۆشنوسێك و زۆری تر.

لەو کتێبانەشی چیرۆکن بۆ منداڵان: سنوقی سەیرو سەمەرەکان ١٩٩٠، درەختی فڕیو ١٩٩٢، ئەمە پاپاگۆیا نییە ١٩٩٤ "بۆیە تووتیم نەنووسی، چونکە لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دەردەکەوێت ئەو باڵندەیە ماماگۆیایە"، فاتمەو خەون دزان ١٩٩٦.

ئەمە جگە لە زۆر کتێبی تر، لە وتار و شانۆگەری و چیرۆك...

من زۆرجار دوای سیحری ناوبانگی نوسەر، کتێب و



بەدەستهێنانی خەڵات ناکەوم و ناشمەوێت دوای ئەوە بکەوم، کە «حیکایەتخوانی شەو» ٢٣ خانەی چاپ و بڵاوکردنەوە رەتی دەکەنەوە، بەڵام دوای سێ ساڵ لەبڵاوبوونەوەی، شەش خەڵات بەدەستدەهێنێت و تا ئێستاش نزیکەی یەك ملیۆن دانەی لێفرۆشراوە. ئەوەندەی هەوڵدەدەم وەك خوێنەریك لە کارەکانی رابمێنم. چونکە کتێبیش پیشەسازییەکە و وەك زۆر کاڵای تر، بەرهەمهێنی هەیە. بەڵکو ئەوەم بەلاوە گرنگە، من چۆن ئەو کتێبە دەبینم. تەنانەت واز لەو سەرنجەش دەهێنم لەناو عەرەبدا هەیە و پێیوایە رەفیق شامی لەو نوسەرانەیە بۆ خوێنەری خۆرئاوایی دەنووسن. بەوپێیەی کاتێك باسی ئوم کەلسوم دەکات، دەڵێت ئوم کەلسومی گۆرانیبێژی میسری، یاخود کە باسی بزنی شامی دەکات، دەکەوێتە وەسفکردنی و چەندین نمونەی تر. چونکە ئەمە وەك گرفتێك نابینم، لەکاتێکدا رەفیق شامی بە زمانی ئەڵمانی دەنوسێت و یەکەم بەرکەوتنی ئەو، لەگەڵ خوێنەری ئەو زمانەدایە.

ئەوەی لە ئەزمونی رەفیق شامیدا تێبینیم کرد و جێگا سەرنجم بوو، لەو دوو رۆمانەیەوە، ئەوەیە بە شێوازێکی زۆر سادە دەنووسێت، وەك ئەوەی لەزمانی مێردمنداڵێکەوە سەیری دنیابکات و رۆمانەکانی تا رادەیەك لە سنوری قسەکردن یاخود شێوازی ئەو حیکایەتخوانانەوە نزیکە، کە عەرەب پێیان دەڵێن «حکواتی» و پیشەیان حیکایەت گێڕانەوەیە لە چایخانە و گۆڕەپانەکاندا. کەسایەتییەکانی، کەسانێکی سادەی ناو کۆمەڵگان، کە رووداوەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیانهێنن و دەیانبەن. پاشان رەفیق شامی لەو دوو کارەیدا دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری دەیەی پەنجای سەدەی رابردوو، ئەوکاتەی رەفیق خۆی منداڵ بووەو هەوڵدەدات گوزارشتێکی جوان و ورد لە واقیعی ژیانو ئینسانەکانی ئەو سەردەمە بکات.



لە حیکایەتخوانی شەودا، رەفیق شامی بەسەرهاتی مام سەلیمی عەرەبانچی دەگێڕێتەوە. مام سەلیم عەرەبانەی تریشقەی پێیە و چەندین ساڵ، لە سییەکانی سەدەی بیستەوە، بەدەم گواستنەوەی رێبوار و موسافیرەکانییەوە لەنێوان دیمەشق و بەیروتدا، کە دوو رۆژی پێچووە، حیکایەت و بەسەرهاتی سەیر و خۆش دەگێڕێتەوە و ئەمەش هۆکاری ناوبانگییەتی.

روداوی رۆمانەکە لەساڵی ١٩٥٩دا دەستپێدەکات، کە کتوپڕ

مام سەلیمی عەرەبانچی تووشی لاڵی دەبێت و توانای قسەکردنی نامێنێت. ئەو مام سەلیمەی «لەتوانایدا بوو چیرۆك بگێڕێتەوە و گوێگرەکانی بخاتە گریان و پێکەنین، ئەگەر دڵیان لەبەردیش بووبێت». شەوێکی گەرمی ئابی ئەو ساڵە، مام سەلیم شەلاڵی عارەقە و کتوپڕ بەخەبەر دێت و هەستدەکات کەسێك لە ژوورەکەیدایە. کاتێك دەپرسێت کێی زەلام؟ دەنگێکی ئافرەتانە وەڵامی دەداتەوە: تۆ بەخەبەریت؟ مام سەلیم هەست بەدەستی ئافرەتێك دەکات، کە بۆنی گوڵە پرتەقاڵیان لێدێت و بە دەموچاوی ئەمدا دەخشێن. دەنگە ژنانەکە بە مام سەلیم دەڵێت هاتووم تا ماڵئاواییت لێبکەم. کە مام سەلیمیش لێیدەپرسێت تۆ کێیت؟ دەنەگەکە پێیدەڵێت من فریشتەی تۆ بووم. ئیدی بۆ سەلیمی باس دەکات کە ئەویش پیربووە و دەبێت ئاسودەبێت. هەرکاتێکیش ئەو بیەوێت ئارام بێت و پشوو بدات، ئەوا مام سەلیم تووشی لاڵی دەبێت و ناتوانێت حیکایەت بگێڕێتەوە. ئیدی بواری وتنی بیست وشە دەدات بە مام سەلیم.

من بۆخۆم کاتێك بەروارێکی سەرەکی دەبینم لە ڕۆمانێکدا، خۆبەخۆ دەگەڕێم بەدوای ئەوەی بزانم چی لەوکاتەدا رویداوە و ڕۆماننوس بۆ ئەو بەرواره بەکاردەهێنێت. چونکە واینابینم کارێکی لەخۆوە بیت. دیارە ڕەفیق شامییش بە مەبەست ئەو ساڵەی هەڵبژاردووە تا تیایدا ڕووداوی ڕۆمانەکەی دەستپێبکات، کاتێك بەدوای روداوی گرنگدا دەگەڕام تا بزانم لەو ساڵەدا چی ڕوویداوە لە سوریا، بینیم لەو ساڵەدا ئاڵای نوێی سوریا بەکاردەهێنرێت و دەستبەرداری ئاڵا کۆنەکەیان دەبن. بەڵام لەو باوەڕەدام ئەمە پەیوەندی بە لاڵ بوونی مام سەلیمەوە نەبێت، هەرچۆن سەردانی چێ گیڤارا بۆ دیمەشق لە ١٩٥٩شدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی نییە بەو روداوەوە. روداوێك جێگای سەرنجم بووبێت کە لەوکاتەدا ڕوویدابێت، یەکگرتنی هەردوو کۆماری میسر و سورییە لەوکاتەدا،کە نزیکەی سێ ساڵی خایاند و دواتر بەهۆی کۆدێتاوە لە سوریا، ئەو یەکگرتنە لە ١٩٦١دا شکست دەهێنێت «دواتر بینیم لەشوێنێکی ڕۆمانەکەدا ئاماژەیەکی بۆ ئەو روداوە تێدایە«. بڵێی شامی ویستبێتی ژیانمان لەوکاتەدا نیشان بدات، کە ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەیەکێك لە خەونە خۆشەکانی خۆیدا دەژیا، کە ئەویش یەکگرتنەوەی پارچەکانییەتی؟ دەشێ ئەمە چوارچێوەیەك بێت بۆ ڕۆمانەکە، بەڵام هەموو شتێك نییە لە پشت ئەو ڕۆمانەوە وەستابێت. مام سەلیم کە حەفتا ساڵی



تێپەڕاندووە، هاوسەری مردووە و کوڕو کچێکی هەیە. کوڕەکەی لە ئەمریکا دەژی و جارجار نامەی بۆ دەنێرێتەوە، بێئەوەی یارمەتی پارەی بدات. کچەکەشی شووی بە پیاوێکی دەوڵەمەند کردووە و لە جێیەکی باکوری وڵات دەژی و کەم کەم یارمەتی باوکی دەدات. لاڵ بوونی مام سەلیم دەبێتە مایەی سەرسامی حەوت هاوڕێ پیرەکەی، کە راهاتبوون هەموو شەوێ گوێ لەچیرۆکە سەیر و نامۆکانی بگرن. هاوڕێکانیشی بریتین لە: عەلی قوفڵچی، مەهدی مامۆستای جوگرافیا، موسای دەلاك، فارسی کۆنە وەزیر، تۆمای تاراوگەنشین، کە سالآنێك لە ئەمریکا ژیاوە، یونسی چایچی، عیسام کە ٢٤ساڵ لەسەر تاوانێك زیندانی کراوە، کە نەیکردووەو لە دوا ساڵیدا تاوانباری راستەقینە دەدۆزرێتەوە و ئەمیش بەردەدرێ.

دوای هێنان و بردنێکی زۆر، هەر حەوت هاوڕێکەی مام سەلیم لەسەرئەوە رێکدەکەون، بە درێژایی حەوت رۆژ هەموو ئێوارەیەك لای مام سەلیم کۆببنەوە و هەر شەوە و یەکێکیان حیکایەتێك بۆ سەلیمی عەرەبانچی بگێڕێتەوە، بەو ئومێدەی توانای قسەکردن بگەڕێتەوە بۆ مام سەلیم و جارێکیتر زمانی بکرێتەوە.

دیارە ناونیشانی ئەم رۆمانە و فەزاکەی، خۆبەخۆ گێڕانەوەکانی شەهرەزادمان بەیاد دەهێنێتەوە لە هەزارو یەك شەوەدا، بەڵام لای شامی، گێڕەرەوە بۆتە پیاو. ئەگەر شەهرەزاد ویستبێتی لە رێگای گێڕانەوەوە بەفریای رزگارکردنی خۆی و ئافرەتانی دیکە بکەوێت، ئەوا لەم رۆمانەدا، حیکایەتخوانەکان دەیانەوێت بەرەنگاری بێدەنگی ببنەوە، تا سەرئەنجام توانای قسەکردن دەگەڕێتەوە بۆ مام سەلیم. ئیدی بە درێژایی حەوت شەو هاوڕێکان کۆدەبنەوە تا هەر جارەو یەکێکیان حیکایەت بگێڕێتەوە و ئەوانی تریش گوێی لێبگرن. بەڵام ئەوەیان کە دواین شەو سەرەیەتی بۆ گێڕانەوە، نازانێت حیکایەت بگێڕێتەوە، هانا بۆ فاتمەی ژنی دەبات، کە کەچی لەیلای جادووبازە. فاتمەش چیرۆکێکی سەیر لەبارەی دایکییەوە دەگێڕێتەوەو کاتێك تەواو دەبێت، سەلیم هاواردەکات: بەتەمەنم گوێم لە حیکایەتێکی ئاوا نەبووە.

سەیرە، سەرئەنجام گێڕانەوەکانی ئافرەت، توانای رزگارکردنیان هەیە.



لە رۆمانی «دەستێك پڕ لە ئەستێرە«دا، پێدەچێت رەفیق شامی وەك زۆر نوسەری رۆژئاوایی، ئەو رۆمانەی بۆ مێردمنداڵان نووسیبێت. ئەم رۆمانە یاداشتی رۆژانەی کوڕێکی ١٤ساڵانە تا

دەگاتە تەمەنی ١٧ساڵی و سێ هاوڕێی هەیە: مام سەلیمی عەرەبانچی تەمەن ٧٥ ساڵ، «دیارە هەر ئەو مام سەلیمەیە کە لە رۆمانی حیکایەتخوانی شەودا ئامادەیی هەیە و لە کۆتایی ئەم رۆمانەدا دەمرێت»، مەحمودی تەمەن ١٥ساڵ و جۆزێفی ١٤ساڵ. دواتر حەبیبی رۆژنامەنوس و چەند کەسێکی تر دێنە ژیانییەوە.
بەڵام یاداشتەکان تەنها رۆژ و مانگەکانی نوسراون و ساڵەکانی دیار نییە. وەك ئەوەی رەفیق شامی ویستبێتی سات و سەردەمی رووداوەکان بۆ خەیاڵی خوێنەر جێبهێڵێت. ئەگەرچی لە وردەکاری ژیان و رووداوەکانەوە تێدەگەین یاخود خوێنەر دەتوانێت مەزەنەی ئەوە بکات، کە ئەوەی روودەدات دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی پەنجا یاخود شەستی سەدەی بیست.
سەرەتای رۆمانەکە بە قسەیەکی مام سەلیم دەستپێدەکات: ئاخ ئەگەر دەمزانی نهێنی پیتەکان ئاشکرابکەم، بەداخەوە! من هاوژیانی زۆر شت بووم، کە شایەنی نوسینەوە بوون، بەڵام ئەمڕۆ بیرم نایەتەوە ساڵانێك لەمەوبەر چی خەوی دەزڕاندم.... سروشت لەیادەوەریدا هیچی نامێنێتەوە جگە لە چیاکانی، دواتر چیاکانیش ون دەبن تا لوتکەکانیان دەمێنێتەوە، پاشان هەموو شتێك لە تەم و مژدا ون دەبێت. بەڵام ئەگەر نووسینم بزانیایە، ئەوا نەوەك تەنها چیا و دۆڵەکانم دەبینی، بەڵکو دڕك بە دڕکی گوڵیشم کەشفدەکردەوە.
ئیدی پاڵەوانە مێردمنداڵەکە بڕیار دەدات بیرەوەرییەکانی خۆی بنووسێتەوە، پاش ئەوەی لە گرنگی پیت و نووسین تێدەگات. کوڕەکە باوکی نانەوایە و باوکی دەیەوێت ئەویش رێچکەی ئەم بگرێتەبەر لەژیانیدا، بەڵام کوڕەکەی خەونی ئەوەی هەیە ببێتە رۆژنامەنوس و شیعریش دەنووسێت. دوای ئەوەی باوکی لە قوتابخانە دەریدەکات، تا لە ئیشەکەیدا کۆمەکی بکات، لەرێگای بردنی نان بۆ ماڵانەوە، حەبیبی رۆژنامەنووس دەناسێت. حەبیب سەر بە حیزبی دەسەڵاتە و پێشتر بەهۆی سیاسەتەوە، دەربەدەریی بینیوە. بەڵام ئێستا کە حیزبەکەی دەسەڵاتی بەدەستەوەیە، ناڕازییە و تێدەگات ئەو خەونەی هەیان بوو، درۆ دەرچوو.
سەرەتا حەبیب دەیەوێت بیرۆکەی بوون بە رۆژنامەنووس لە مێشکی کوڕەکە دەربکات، بەڵام دواتر لە عەشقی کوڕەکە تێدەگات بۆ ئەوکارە و هەوڵدەدات کاری رۆژنامەنووسیی فێربکات. تا سەرئەنجام رێگایەکی سەیر دەدۆزنەوە بۆ بڵاوکردنەوەی نووسینەکانیان،



که بە «ڕۆژنامەی گۆڕەوی» ناوی دەبەن. ئەم ڕۆژنامە سەیرەش بریتییە لە نووسینی وتارەکانیان لەسەر کاغەزی تەنك تا بیخەنە ناو لۆچی گۆرەوییەوە و پاڵەوانەکە لەگەڵ مەحمودی هاوڕێیدا گۆڕەوییەکان بفرۆشن. ئیدی ئەو ڕۆژنامەیە بەو شێوەیە بڵاودەکەنەوە. حەبیب ئاشکرا دەبێت و دەستگیردەکرێت، بەڵام ئەمان درێژە بەکاری نووسین و بڵاوکردنەوەی دەدەن.
لەم ڕۆمانەدا کە بەشێوەی یاداشتە، بەزمانێکی سادە باسی ژیان و بارودۆخی کۆمەڵگا، فرە ئاینی، گەڕەك، عەشقی کوڕەکە بۆ نادییە، خەونی منداڵانە و تێکەڵبوون بە سیاسەت و زۆر وردەکاری تر دەکرێت. لێرەشدا مام سەلیمی عەرەبانچی هەر ئەو مرۆڤە سادە و پڕ لە حیکایەتەیە، کە سنوری واقیع و خەیاڵی لێ تێکەڵ بووەو زۆرجار بەسەرهاتی سەیر دەگێڕێتەوە، تا مردنەکەی چەند ڕۆژێك دوای کۆدێتایەکی سەربازی، شێوە ئەفسانەیەك وەردەگرێت.

کوڕە لاوەکە لە ٨/١٤دا نووسیویەتی:
ئەمڕۆ مام سەلیم حیکایەتێکی کورتی بۆ گێڕامەوە، لە کەسانی دیکەی بیستبوو. ئەو ناوی وڵاتەکەی پێنەوتم، بەڵام وای بۆ دەچم ئەم چیرۆکە هەموو ڕۆژێك لە سەر سنوری زۆر وڵات ڕوودات. ئەمەش چیرۆکەکەیە:
موسافیرێك کاتێك عەرەبانەکەیان لە سنور نزیك دەبێتەوە، بە موسافیرەکانی تر پێدەکەنێ. بەگشتی جلوبەرگی پیاوەکە سەیربوو، چونکە ئەو ڕووت بوو، ئەگەر ئەو قوماشە نەبوایە، کە لە ناوقەدییەوە ئاڵاندبووی.
بە موسافیرەکانی وت: تۆ شوکولاتت پێیە، تۆش ڕادیۆ، تۆش ریکۆردەرت پێیە؛ پێکەنی و درێژەی پێدا: لەسەر سنور هەموو شتێکتان لێدەسەنن. من ئەم وڵاتە دەناسم. یاساغە هەرشتێکی بۆ بچێتە ژورەوە.
موسافیرەکان لە پیاوەکە بێزاربوون، بەڵام ئەو بەدرێژایی ڕێگاکە، نەماندو بوو نە بێزاربوو لە نارەحەتکردنیان: تۆ.. چیت پێیە؟ سەعات، کراس؟ ئەی تۆ.. چۆن بەم چاکەتەوە لەسنور دەپەڕیتەوە؟. تا زیاتر لە سنور نزیك بوونایەتەوە، خەڵکەکە مێشکیان زیاتر داغان دەبوو بەدەستییەوە، ئیدی وردە وردە تێدەگەشتن بۆچی ئەم شێتە، نیمچە ڕووتە سەفەردەکات. تەنانەت ئەو دەسماڵەی خۆی پێداپۆشی بوو، دروستکراوی ئەو وڵاتە بوو، کە لێی نزیك ببوونەوە.
کاتێك عەرەبانەکە گەشتە سنور، موسافیرەکان بۆیان دەرکەوت



پۆلیسی گومرگ زۆر لەوە خراپترن موسافیرە نیمچە رووتەکە باسی دەکرد، کە ئەوکات دانیشتبوو پێدەکەنی، لەکاتێکدا پۆلیس هەموو شتێکی لە هاوسەفەرەکانی دەسەند: رادیۆ، شوکولات و چاکەت.
کاتێك نۆرەی ئەم هات، بە شانازییەوە وتی: من رووتم، ئەم دەسماڵەش دروستکراوی خۆتانە.
فەرمانبەرەکەی گومرگ بە سیمایەکی ساردەوە لێی پرسی: تۆ زۆر دەزانیت.. وا نییە؟
پیاوەکە بە خۆهەڵکێشانەوە وتی: بەڵێ زۆر دەخوێنمەوە.
فەرمانبەرەکەش لێی پرسی: چی دەخوێنیتەوە؟
پیاوەکە ناونیشانی زۆر کتێبی پێوت،
فەرمانبەرەکەش ناونیشانی کتێبەکانی نووسی و بەرێزەوە پرسیاری ئەوەی لێکرد، کە ناوی نوسەرەکەی راست نووسیوە. کاتێکیش پیاوەکە لە وتنی ناونیشانی ئەو کتێبانە وەستا، کە خوێندبوونییەوە، فەرمانبەرەکە لێیپرسی: ئەمە هەمووی بوو؟ پیاوەکە بە خۆهەڵکێشانەوە لیستێك ناوی کتێبی تری پێوت، کە خوێندبوونییەوە. فەرمانبەرەکەش هەموو ناونیشانەکانی نووسی. وردە وردە پیاوە رووتەکە تێگەشت، کە چەنەبازییەکەی بەرەو چ خەرەندێکی بردووە، ئیدی بێدەنگ بوو و هەستی بە دڵتێکەڵهاتن و تێکچوون کرد.
فەرمانبەرەکە بە پیاوە خۆ بەزیرەك زانەکەی وت: دەی ئاوا! تۆ دوو سەد کتێب لە سەرتدا هەڵدەگریت و دەتەوێت بەقاچاخ بیانبەیت،

لەکاتێکدا نیوەی ئەم کتێبانە یاساغن لە وڵاتدا. دەی بگەڕێوە، ئەم قاچاخچیانە سەیرن، هەر رۆژەی شێوازێکی نوێ دەدۆزنەوە بۆ قاچخی کردن. ئیدی جنێوی بە پیاوە روتەکەداو گەڕاندییەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوو.

لە خەون و خەیاڵی ئەو منداڵەوە، ئاڕاستەی سێ نەوە بەدەردەکەون لەم رۆمانەدا.
ئەوەی بۆ من مایەی سەرنج بوو، بوونی ئەو عەشقە سەیرەی مێردمنداڵەکەیە بۆ وەستان لەبەردەم ستەمکاری و نادادپەروەریدا و هەستدەکەیت کۆی روداوەکان زوو گەورەی دەکەن.

شامی دەڵێت زۆر گیرم خواردبوو بەدەست ئەوەی ئەم رۆمانە چۆن بگێڕمەوە. ئیدی پاش دوودڵییەکی زۆر لەنێوان شێوازی گێڕانەوە و نامە نووسیندا، نووسینەوەی یاداشتم هەڵبژارد.
پێدەچێت



رەفیق شامی
حیکایەتخوانی
چیرۆکە
سادەکانی




مرۆڤە سادە و پەراوێزەکانی کۆمەڵگا بێت، کە لەناو
ڕووداوە گەورە و سیاسییەکاندا دەژین.






سورمە

# دەربارەی زنجیرە کتێبی توایلایت

**ئامادەکردن و وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە: سورمە**

توایلایت ئەو زنجیرە کتێبەیە کە خانمە نوسەری ئەمریکی ستێفانی مەیا خاوەنێتی، تا ئێستا بۆ سەر ٣٨ زمانی جیهانی وەرگێڕدراوە و ١١٦ میلیۆن کۆپی لێ فرۆشراوە. ئەم زنجیرە کتێبە لە ٤ بەرگ پێکهاتووە و یەکەم بەشی بە ناوی توایلایت «خۆرئاوابوون» لە ساڵی ٢٠٠٥ دا بڵاوکراوەتەوە. بەشەکانی تری توایلایت بە ناوی نیو موون»مانگی تازە» ٢٠٠٦، ئێکلیپس «مانگ گیران» ٢٠٠٧، برەیکینگ داون «سپێدە» ٢٠٠٨.

دواتر ئەم ٤ رۆمانە کرایە ٥ فیلمی فانتازیای رۆمانسی، کریستین ستیوارد دەوری بێلا دابینێت و وە رۆبەرت پاتینسۆن ڕۆڵی ئێدوارد دەبینێت.

کاری دەرهێنانی ئەم فیلمە لە لایەن کاسرین هاردویک، کریس



ویتز، دەڤید سلەید و بیڵ کۆندۆن ـەوە کراوە. زمانی فیلمەکە ئینگلیزییە و بودجەکەی ٣٨٥ میلیۆن دۆلار بووە.
تێمای سەرەکی ئەم ڕۆمانە باسی ژیانی کچێکی گەنجە بە ناوی ئیسابێلا سوان کە بە بێلا بانگ دەکرێت. بێلا عاشقی ئێدوارد کۆلین دەبێت کە تەمەنی ١٠٤ ساڵە و خوێنمژە.

کتێبی یەکەم: توایلایت/ خۆرئاوابوون
سەرەتای ئەم کتێبە بە سەفەری بێلا دەست پێدەکات لە فۆنیکسی ئاریزۆنا ـ وە کە ماڵی دایکی لێیە بۆ فۆرکس لە واشینتۆن کە ماڵی باوکی لێیە.
دیارە لێرەوە دەزانین کە دایك و باوکی لێکجیابونەتەوە و بێلاش بۆیە دایکی جێدێڵیت تا بتوانێت لەگەڵ زڕباوکەکەیدا گەشتی خۆیان بکەن، چونکە زڕباوکەکەی یاریزانی یاری بەیسبۆڵە.
چاپتەری یەکەمی ڕۆمانەکە باسی نیشتەجێبوونی بێلا ـ مان لەفۆریکس لە ماڵی باوکی بۆ دەکات، وەك چۆن دەربارەی دەستکردنی ئەمە بە خوێندنی لە دواناوەندی ئەو شارە. ڕووداوەکانی ئەم کتێبە لە ڕۆژەکانی سەرەتای چونە خوێندنی بڵاوە دەستپێدەکات، کاتێك ڕاستەوخۆ یەکێك لەهاوپۆلەکانی بە ناوی ئێدوارد، سەرنجی ڕادەکێشێت. لە چەند ڕووداوێکی جیاوازدا بێلا هەست بەوە دەکات کە ئەم کورە مرۆڤ نییە و هەر بەهۆی ئەو جیاوازیانەشەوە کە لەگەڵ ئەوانیتردا هەیەتی، بێلا بۆی دەردەکەوێت کە ئێدوارد خوێنمژە و لە خێزانی کۆلینە کە کۆمەڵە خوێنمژێکی ئەو ناوچەیەن. جیاوازی ئەم گروپە لە خوێنمژەکانی تر ئەوەیە کە ئەمان بەتەنیا خوێنی ئاژەڵ دەخۆنەوە و وازیان لە خواردنەوەی خوێنی مرۆڤ هێناوە.
کۆتابەشی کتێبی یەکەم هێرشی جەیمس ـە کە سەربە گروپێکی ترە و مەترسیدارترن، بە هۆکاری ئەوەی خوێنی مرۆڤ دەخۆنەوە. بێلا ناچار دەبێت بەرەو فۆنیکس بگەڕێتەوە تاکو خۆی لە جەیمس بشارێتەوە. دوای ئەوەی جەیمس بەهۆی ئەو سێنسە «هەستەوەر»ە جیاوازانەوە کە خوێنمژەکان هەیانە بێلا دەدۆزێتەوە و هێرشی بۆ دەبات، هاوکات ئێدوارد بە فریای بێلا دێت، تا دواجار بە هاوکاری خێزانی کۆلین، جەیمس دەسوتێنرێت.



چیرۆکی پشت توایلایت لە زمانی نوسەرەکەیەوە
من ڕۆژی دەستپێکردنی نوسینی توایلایتم زۆر بەباشی لەبیرە، ڕێك ئەو ڕۆژەیە کە منداڵەکانم دەستیان کرد بە

خوێندنی وانەی مەلەکردن، هەر لەبەر ئەمەیە من دەتوانم بڵێم لە مانگی ٦ ی ساڵی ٢٠٠٣ دا دەستم کرد بە نوسینی.
ئەمە لە کاتێکدا من پێشتر هیچم نەنوسیبوو جگە لە چەند چاپتەرێکی کەم لە چەند چیرۆکێکی تر کە هەرگیز تەواوم نەکردن و لەدوای لەدایکبوونی یەکەم کوڕمەوە کە ٦ساڵ بەر لە ئێستابوو، هیچی تریشم نەنوسی.
بەرەبەیانی رۆژی ٦/٢ لە خەونێکی تەمومژاوی خەبەرم بۆوە. لە خەونەکەمدا دوو کەس لە مێرگێکی دارستاندا لە گفتوگۆیەکی گەرموگوڕدا بوون.
یەکێك لەو دوو کەسە کچێکی ئاسایی بوو، ئەوەی تریشیان کەسێکی ئێجگار جوان و بریسکەدار و خوێنمژ بوو.
هەردوکیان لەبارەی زەحمەت و سەختیی دووشتەوە گفتگۆیان بوو:
١/ هەردووکیان عاشقی یەکتر بوون.
٢/ خوێنمژەکە بەتایبەت بۆنی خوێنی کچەکەی لای سەرنجڕاکێش بوو، هەستیشی دەکرد زۆر سەختە بتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات تا دەمودەست کچەکە نەکوژێت.
بۆ ئەوەی بتوانیت نوسینەوەی ئەم خەونەم ببینیت، دەتوانیت سەیری چاپتەری ١٣ بکەیت لە کتێبەکەدا.
لەگەڵ ئەوەشدا کە یەك دونیا شت هەبوو من دەبوو بیانکەم، وەك ئامادەکردنی نانی بەیانی بۆ منداڵەکان، گۆرینیان و پاکردنەوەیان، دۆزینەوەی بەرگی مەلەکردنیان کە هەرگیز لە جێگەی خۆی دانەدەنرایەوە و زۆر شتی تریش، من لەناو جێگاکەمدا مامەوە و بیرم لە خەونەکە دەکردەوە.
من ئەوەندە کونجکۆڵ بووم لە چیرۆکی ئەم دوو عاشقە بێ ناوە هەر بۆیە ڕقم لە ئایدیای بیرچونەوەی خەونەکەم بوو. ئەمە لەو خەونانە بوو کە وات لێدەکات حەز بکەیت تەلەفون بۆ هاوڕێیەکت بکەیت و توشی سەرئێشەی بکەیت، بەوەی کە بەدورودرێژیی باسی خەونەکەتی بۆ بکەیت.
«لەهەموشی سەختر ئەوە بو کە خوێنمژەکە بەشێوەیەکی هێند بێشەرەفانە قۆز بوو، نەمدەویست ئەو وێنەیەی لەناو مێشکمدا وون بکەم».
بەبێ ئەوەی بمەوێت، هەستام هەمو ئەو ئیشوکارانەم ڕاپەڕاند

که زۆر گرنگ بوون، ئەوانەی تریش که بەگرنگم نەدەزانین، پشتگوێم خستن. پاشان چومە بەردەم کۆمپیوتەرەکەم تا بنوسم، شتێك که هێند دەمێك بوو نەمکردبوو، نەمدەزانی بۆچی ئەم زەحمەتە ئەدەمە بەرخۆم. بەڵام من نەمدەویست خەونەکەم وون بکەم، بۆیە هەموو ئەو شتانەم نوسی که بیرمدەکەوتنەوە، کارەکتەرەکانیشم بە «ئەم» و «ئەو» ناونابوو.
ئیدی لەو کاتەوە رۆژێك بەسەرما تێنەپەڕیوە و من تیایدا نەنوسم، ئەو رۆژانەی که خراپبوون پەرەیەك یان دوانم نوسیوە، رۆژە باشەکانیش چاپتەرێکم تەواو کردووەو هەندێکجار لەوە زیاتریشم نوسیوە. کاتی نوسینی من زیاتر شەو بوو، ئەو کاتەی منداڵەکان دەنوستن، چونکە دەمتوانی بنووسم و بە باشی چڕببمەوە بەبێ ئەوەی هەموو ٥ خولەك جارێك دابڕێم.
لە دیمەنی مێرگەکەوە دەستم پێکرد تا کۆتایی، پاشان دیسان دەچومەوە سەرەتاو هەندێکی ترم دەنوسی تا پارچەکان یەکتریان تەواو دەکرد.
سێ مانگ دواتر، لە مانگی ٨ دا «بزماری ئاڵتونی»م داکوتی، مەبەستم لەو بەندەی که هەموو پارچەکانی بەیەکترەوە دەبەستەوە.
ناونانی هەردوو کارەکتەرەکەم کاتی ویست، بۆ خوێنمژەکە»کە خۆم لە رۆژی یەکەمەوە عاشقی بووبووم» بریارمدا ناوێکی بۆ بدۆزمەوە که رۆژێك لە رۆژان بە ناوێکی رۆمانسی زانراوە، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات لە ئارەزووی کەسدا نەماوە، هەریەکە لە رۆچێستەری چارلۆت برۆنتێ و فێرارسی جەین ئۆستن ئەو کارەکتەرانە بوون که گەیاندیانم بەوەی ناوی ئێدوارد هەڵبژێرم. که تاقیمکردەوە، هەستمکرد گونجاوە. ناونانی کچەکەم بەلاوە قورستر بوو، هیچکام لەو ناوانەی بۆم دادەنا راست و گونجاو دەرنەدەچوون، دوای ئەو هەموو کاتەی لەگەڵیدا بەسەرمبردبوو، وەك کچی خۆم خۆشمدەویست، هەر بۆیە هەستمدەکرد هیچ ناوێك لە ئاستی ئەو سۆزەی مندا نیە بۆ ئەو. لە کۆتایدا لە ژێر کاریگەری ئەو خۆشەویستیەدا، ئەو ناوەم لێنا که بۆ کچەکەمم هەڵگرتبوو، ئەو کچەی تا ئێستا نەهاتبوو، وا پێنەدەچوو دەربکەوێت، ئیسابێلا.
ئێدوارد و بێلا ناونران، بۆ ناوی کارەکتەرەکانی تریشم دەستم کرد بە پشکنین و بەدواداچوون، ئەمەش لەڕێی گەران بەدوای لیستی تۆمارکردنی ئەو ناوانەی زۆرترین داواکاریان لەسەربووە و لەو سەردەمەدا بەکارهاتوون که



کارەکتەراکانی منی تیادا ژیاون.
بۆ شوێن و لۆکەیشنی روداوەکانیش پێویستم بە هەندێك جێگە بوو کە بەشێوەیەکی گاڵتەجارانە تەڕ و باراناوی بوون، بۆ ئەمەش، وەك هەموو جارەکانی تر کە چۆن بەدواداچوونم دەکرد، سەیری گۆگڵم کرد، بۆ ئەو شوێنانەی ئەمریکا گەڕام کە زۆرترین ڕێژە بارانیان تیا دەبارێت.
بەدواداچونەکەم گەیاندمییە ئۆلۆپیك پێنینسوێلا لە واشینۆن، ئەوجا بە ووردی سەیری نەخشەی ئەو ناوچانەم کرد کە لەو هەرێمەدا هەبون، بۆ شوێنێکی بچکۆلە دەگەڕام کەوتبێتە دەرەوە و بە دارستان دەورەدرابێت.
ئیدی لەویادا ڕێك لەو شوێنەدا کە من دەمویستم، شارێکی بچکۆلەم بە ناوی فۆرکس دۆزییەوە، گەر خۆشم ناوم بنایە هەرگیز لەوە باشتر دەرنەدەچو. دواتر بەدوای وێنەی ئەو شارەدا گەڕام، لە راستیدا دوای بینینی وێنەکانی ئەو شارە ئەوە تێگەیشتم کە جگە لە ناوەکەی وێنە جوانەکانیشی سیحری خۆیان لێدەکردم. لەو کاتەدا کە بۆ زانیاری زیاتر دەگەرام دەربارەی فۆرکس، ناوچەی لا پوش ـم دۆزییەوە کە بە ماڵی خێڵە سەرەتاییە ئەمریکیەکان خێڵی کیولت دادەنرێت. چیرۆکی کیولتەکان زۆر سەرنجراکێشە، هەندێك لە ئەندامە دروستکراوەکان فیکشنـ ی ئەم خێڵە زۆر بە خێرایی بونە پێداویستییەکی گرنگ بۆ چیرۆکەکەی من. بە درێژایی هەمو ئەم کاتەش بێلا و ئێدوارد لەناو مێشکمدا دەنگیاندەهات و بەئاسانی بێدەنگ نەدەبون. هێندەی پێم بکرایە شەوان درەنگ دەخەوتم تا هەموو ئەو شتانەی لەخەیاڵ و لەسەرمدا بوون دەمنوسین، دواتریش زۆر بەشەکەتی، بە گاگۆڵکێ دەچووومە ناو جێگاکەم، شەوان منداڵەکەم نەدەخەوت، تا دەستپێکردنەوە بە دیالۆگێکی تر لە سەری مندا. ڕقم لەوە دەبوو هەرشتێکم لە دەست بچووبایە بە هۆی بیرچونەوەوە، بۆیە دەبوو هەستمەوە و بچمەوە لای کۆمپیوتەرەکەم، دواتر دەفتەر و قەڵەمێکم پەیداکردو لە تەنیشت چرپاکەمەوە دامنا تاوەکو بتوانم ئەو تێبینییە بچووکانەی خۆم بنوسمەوە و کەمێکیش بخەوم. ئەوە بۆ من هەمیشە کێبڕکێیەکی چێژبەخش بوو، کە بەیانیان هەڵدەستام و هەوڵمدەدا ئەو کۆدانە بکەمەوە بە نووسین کە شەو بە خەتێکی ناشرین و بێسەرەوبەرە لەمسەری پەرەکەوە بۆ ئەوسەری، لەتاریکیدا نوسیبووم.
بە ڕۆژیش نەمدەتوانی لە کۆمپیوتەرەکەم دووركەومەوە، ئەو



کاتانەش کە ناچاربوم بچمە وانەی مەلەکردن و لە گەرما و تیشکی خۆری فۆنێکسیشدا هێندە سەرقاڵی چنینی ڕووداوەکان بووم، کە دەگەرامەوە ماڵەوە نەمدەتوانی بەو خێراییەی پێویست بوو بنوسم.
ئەو کاتە ئەریزۆنا لە کەشوهەوا هاوینەییەکەی خۆیدا بوو. گەرمی و خۆر، گەرمی و گەرمی، بەڵام ئێستا کە بیر لەو سێ مانگە دەکەمەوە من تەنیا بیر لە فێنکی و باران و شتی سەوز دەکەمەوە، هەر وەك ئەوەی من ئەو هاوینەم لە دارستانە باراناویەکانی ئۆلۆمپیك بەسەربردبێت. ئەو کاتەی قەوارە و بونیادی رۆمانەکەم تەواو کرد، دەستم کرد بە نوسینی تێبینی و کۆتایی هێنانی رۆمانەکەم. ئەمە گەیاندمیە ئەوەی کە بەراستی من نەمدەویست دەستم لە کارەکتەرەکانی ناو رۆمانەکەم بەربێت، هەر بۆیە دەستم کرد بە درێژکردنەوەی ئەم رۆمانە و هاوکاتیش زیادکردن و دەستکاریکردنەوەی توایلایت بە جۆرێکی چڕوپڕ و بەردەوام. ئێمیلی، ئەو خوشکەم کە لە خۆم گەورەتربوو تاکە کەسێك بوو کە دەیزانی من خەریکی چیم. لە مانگی ٦ دا هەر جارێك چاپتەرێکی کتێبەکەم تەواو دەکرد دەمنارد بۆ ئێمیلی، ئەو بووە یەکەم خوێنەری ئەم کتێبەم و لەگەڵ تەواوبوونی کتێبەکەمدا پێشنیاری کرد توایلایت چاپ بکەم. گێرانەوەی چیرۆکی بەزەحمەت چاپکردنی ئەم کتێبە دادەنێم بۆ کاتێکی تر. بەڵام دەتوانم بڵێم توایلایت خەونێك بوو کە لەماوەی شەش مانگدا  بینرا، نووسرا و بۆ چاپکردنیش قبوڵکرا.

ناوی کتێبەکان بە ئینگلیزی

**Twilight 1.1**
**New Moon 1.2**
**Eclipse 1.3**
**Breaking Dawn 1.4**

سەرچاوەکان:
ماڵی فەرمی ستێفانی مایا لە تۆڕی ئینتەرنێت
**http://www.stepheniemeyer.com/**



# کازینۆی منداڵان، کازینۆی دەنگە جیاوازەکان



## سۆران ئازاد

هەر کاتێك بمانەوێت لەبارەی ڕۆمانەوە بدوێین، دەکەوینە بەردەم جیاوازیی ڕۆمان و ژانرەکانی دیکەی ئەدەب. بەو پێیەی ڕۆمان هەڵگری شوناسێکی دیاریکراو نییە. بەڵام بوونی ڕۆمانی دۆن کیشۆت ـ ی سێرڤانتس زیاتر لە شوناسی ڕۆمانمان نزیك دەکاتەوە. دۆن کیشۆت قارەمانێکی ناقارەمانە. ویستی بوون بە قارەمان، یان ڕۆڵی قارەمان لە سەدەکانی ناوەڕاست بە دواوە، لە وەهمێك زیاتر شتێکی تر نییە. لەوە دەچێت دێوەکانی مۆدێرنەتییە، لەوە گەورەتر بن، کە دۆن کیشۆت و قارەمانەکانی دیکە بتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوە. ئەگەر لە پێش مۆدێرنەتییە قارەمان ڕۆڵێکی ئاشکرای هەبێت و دوژمنەکانیشی دیاربن، ئەوا لە ناو مۆدێرنەتییەدا دوالیزمی قارەمان و دوژمن کۆتاییان پێ دێت. ئەدەبی مۆدێرن تێکشکێنەری وێنەی قارەمانە و دەبێتە سەکۆیەك بۆ گوزارشتکردن لە دەنگی جیاواز. دەتوانم بڵێم ڕۆمان پێشەنگی ئەو ژانرانەیە، کە وێنەی قارەمانیان تێکشکاندووە. بۆیە

بەردەوام لە دوای دۆن کیشۆتەوە، کە قارەمان دەبێتە کەسێکی گاڵتەجاڕ و خەڵەفاو، دەنگی جیاواز و لاواز دێنە ناو ئەدەب.
لەوە دەچێت ئەدەب تەواو لەوە دڵنیا بووبێت، کە قارەمان ناتوانێت گوزارشت و تێکشکێنەری دنیای مۆدێرن بێت، بۆیە زۆربەی جار لە ئەدەبی مۆدێرندا هەوڵ دراوە وێنە گاڵتەجاڕییەکەی دنیای ئێستا پیشان بدرێت. یەکێك لە نموونە دیارەکان، ڕۆمانی «پاسەوانێك لە مەزرا ـ **The Catcher in the Rye**»ی «سالنجەر»ە، کە کارەکتەرە سەرەکییەکەی «هۆڵدن کۆڵفیڵد»ە.
هۆڵدن کۆڵفیڵد کارەکتەرێکی درۆزنە، بەڵام درۆزنێکی ڕاستگۆیە. ئێمە لە ڕێگەی ڕاستگۆییەکەیەوە دەزانین، کە ئەو درزۆنە. ئەگەرنا دەکرا وەکو قارەمانەکانی دیکە، ستایشی کارە باشەکانی خۆی بکات، بەڵام لای ئەو ژیان لەسەر شەقامەکاندا، دەکەوێتە دەرەوەی کاری باش. بە مانایەکی تر، ژیانی لە شەقامە مۆدێرنەکان و شارە کەپیتاڵیستەکان تەنیا ڕووشکێنییەکی ئەبەدییە.
شکستهێنان یان پاپەندنەبوون بە سیستەم، جا سیستەمی خێزان، کۆمەڵگا، پەروەردە یان هەر سیستەمێکی دیکە بێت، وەکو هۆڵدن ڕووبەڕووی دۆخێکی پووچگەرامان دەکاتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە ڕۆمانی پاسەوانێك لە مەزرا (**The Catcher in the Rye**)، لە زۆربەی کتێبخانە و خوێندنگاکانی ئەمەریکا قەدەغە کرا. ئەگەر دۆن کیشۆت بە گژ وەهم و هێزە گەورەکانی مۆدێرنەتییەدا بچێتەوە، ئەوا هۆڵدن دەزانێت ئەو بەگژداچوونەوەیە ئەنجامی نییە، بۆیە لەجیاتی ڕووبەڕووبوونەوە، هەوڵی ڕیسواکردنی سەدەی بیستەم دەدات، وەك پڕ دیاردەترین سەدەی مۆدێرنەتییە.
بە هێنانەوەی ئەو دوو نموونەیە، بۆمان دەردەکەوێت یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی ئەدەبی مۆدێرن و ئەو دابڕانەی لەگەڵ ئەدەبی پێش خۆی هێناویەتە کایەوە، بریتییە لە گوزارشتکردن لە دەنگی جیاواز. ئەدەب بووەتە کەناڵی فرەدەنگی و جیاوازی. بە تایبەت لە ڕۆماندا، ئەدەب سەکۆی گێڕانەوەی حەکایەتی سەرکەوتن و ڕووداوە خەیاڵئامێزەکانی پاڵەوان نییە، بەڵکو سەکۆی جیاوازی و دیارنەمانە لە ناکاوەکانە. بۆیە هیچ سەیر نییە، کە ئەو هاوکێشانە لە ڕۆمانێکی کوردیدا، کە ڕۆمانی «کازینۆی منداڵان»ە، بە ڕوخسارێکی جیاواز ڕووبەڕوومان دەبنەوە.
دەتوانم بڵێم دوو خەسڵەتە سەرەکییەکەی ئەدەبی مۆدێرن بە شێوەیەکی قووڵ لە ڕۆمانی کازینۆی منداڵان دا بەرجەستە بووە. یەکەمیان، بوونی



جیاوازییەکی گەورەی نێوان کارەکتەرەکانە، کە ئەوەیان خەسڵەتێکی دیاری ئەدەبی کاروان کاکەسوورە. دووەمیان، برتییە لە دیارنەمانی لەناکاوی کارەکتەرەکان، کە ئەوەیان گوزارشتێکی دەگمەنی دنیای مۆدێرنەتییەیە. ئەوەی بووەتە هۆی ئەوەی کازینۆی منداڵان دابڕانێکی لەناکاو بێت لە شێوازی باوی ئەدەبی گێڕانەوەی کوردی و تەنانەت بەرهەمەکانی کاکەسوور خۆیشی، هێنانی کۆمەڵێك دەنگی جیاوازە، کە هەم لە کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتدا ئەو دەنگانە هەن، بێ ئەوەی پێشتر لە زماندا ڕووبەڕووی بووبینەتەوە، هەم ئەو زمانەی لەو ڕۆمانەدا بەری دەکەوین، بە تەواوەتی دابڕانی لەگەڵ زمانی باودا دروست کردووە. بەشێکی زۆری ئەدەبی گێڕانەوەی کوردی، لە دوالیزمی قارەمان و بێهێز دەرنەچووە. ئەوەی لە ڕۆمانی کازینۆی منداڵان دا ڕووبەڕووی دەبینەوە ئەوەیە، کە ناتوانین شوناسێکی دیاریکراو بە کارەکتەرەکان بدەین. ئەوە هەمان دیاردەی ژیانی مۆدێرنەتییەیە، کە مرۆڤەکان لە یەککاتدا دەیان شوناسی جیاوازیان هەیە و کەچی ناشتوانین بە تەواوەتی شوناسیان بزانین. شوناس لە ژیانی مۆدێرنەتییەدا لە دەیان دەمامکی جیاوازدا خۆی نمایش دەکات و کەچی لە ناوەڕۆکیشدا بەتاڵە. خودی ئەو بەتاڵییە یان بۆشاییە، نیشانەی نادیارییەکی وجودییە، کە باڵی بەسەر ژیانی تاك لە شێوازی ژیانی مۆدێرندا، کێشاوە. قسەکردن لەبارەی کارەکانی کاروان کاکەسوورەوە، یەکسانە بە قسەکردن لەبارەی دیوی ناڕاستەوخۆی ئەدەب لە گەیاندندا. ئەگەر لە ڕووی دەروونشیکار ئەدەبییەوە بڕوانین «مەبەستمان لە سایکۆلۆگایس شیکارکرنی دەروونییە، کە لە کوردیدا دەروونشیکاری بە کار دێت لە بەرانبەر وشەی (Psychologizing)ی ئینگلیزییدا، کە جیاوازە لە دەروونناسی (Psychology)، ئەدەب خۆی بەرهەمێکە پشتی بە ناڕاستەوخۆیی بەستووە لە گەیاندندا. بەڵام لەو سیستەمە ناڕاستەوخۆیە، کە ئەدەبی لەسەر دامەزراوە، ئەوا دووبارە هەڵگری ئاڕاستەی دیکەی ناڕاستەوخۆییە. دەکرێت بەو هاوکێشەیە بڵێین ناڕاستەوخۆی ناڕاستەوخۆ. بەرهەمەکانی کاکەسوور ناڕاستەوخۆی ناڕاستەوخۆن لە بەرجەستەکردن و وێناکردندا. کاکەسوور بەردەوام ئیشی لەسەر وێنەی کەرتبوو و ناتەواودا کردووە، بەڵام بە هۆی هونەر و زمانی گێڕانەوەوە هەوڵ دەدات ئەو وێنانە بە شێوەی



ناڕاستەوخۆ بە یەکەوە ببەستێتەوە، بەبێ ئەوەی ئەو پرۆسێسە لە دروستکردنی وێنەی تری ناتەواو داببڕێت.
ڕۆمانی کازینۆی منداڵان، وەکو بەرهەمەکانی تری کاروان کاکەسوور کۆمەڵێك ڕەهەندی جیاواز لە خۆی دەگرێت، بەڵام ئەوەی ئەو ڕۆمانە جیا دەکاتەوە، بەرجەستەکردنی ململانێی کەلتوورە جیاوازەکانە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. (کاکەسوور) لە ڕێگەی کارەکتەرەکانیەوە دیوە شاراوەکانی مێژووی یەك سەدەی عێراق و ململانێ جیاوازەکان وێنا دەکات. کازینۆی منداڵان کەناڵی فرەدەنگیی کارەکتەرە جیاوازەکانە. کاروان لە ڕێگەی کۆمەڵێك چین و توێژی لاوەکیی کۆمەڵگاوە، بۆ نموونە سۆزانییەکان، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی دەخاتە ژێر ڕۆشنایی هەڵوەشاندنەوەوە. کێشەی دەوڵەت ـ نەتەوە ڕەهەندێکی گرنگی ئەو ڕۆمانەیە، کە بە هۆی بەیەکدادانی کەلتوورییەوە سەرچاوەیان گرتووە. ئەو ڕۆمانە لە جۆری (Bildungsroman)ە. ئەو جۆرە ڕۆمانە گوزارشت لەو کارەکتەرانە دەکات، کە لە پرۆسێسی تێپەڕبوونی کاتدا، گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. ئیشەکانی «هێرمان هێسە» و «جی دی سالینجەر»یش دەکەونە ئەو خانەیەوە. وەك دەبینین کارەکتەرەکانی کاروان لە دۆخی ئاسایی خۆیاندا نامێننەوە، بەڵکو هەمیشە لە گۆڕاندان و لە بەردەرم تێپەڕبوونی کاتیشدا بێباکن.
لە ڕووی سایکۆلۆجییشەوە، کاروان وەکو ئافرێنەر و منداڵێك مامەڵەی لەگەڵ دیاردەکاندا کردووە. دەتوانم بڵێم کاروان لەسەر شێوازی گەمەی منداڵان ڕۆمان دەنووسێت. چۆن؟ ئەگەر سەرنج بدەین منداڵ لە کاتی یاریدا کۆمەڵێك کەرەستەی لەژێر دەستدایە و هەوڵ دەدات لە یەککاتدا هەموویان بە کار بهێنێت. هەمیشە جێگۆڕکێ بە کەرستەکان دەکات و وێنەی دیکەیان لێ دەخوڵقێنێت. لێرەدا منداڵ خوڵقێنەر یان ئافرێنەرە. بە هەمان شێوە کاروان کۆمەڵێك کەرەستەی لەژێر دەستدایە، کە هەوڵ دەدات بە شێوەی جیا بە کاریان بهێنێت و وێنەی تازەتریان لێ دروست بکات. بۆیە دەبینین بەردەوام تێکەڵکردنی مرۆڤ و ئاژەڵەکان ڕووبەرێکی بەرفراوانی لە کارەکانی کاروان داگیر کردووە. لە چیرۆکی «خوێنی کونەپەپۆ»دا دۆخی سایکۆلۆجیی کارکتەرە سەرەکییەکە بۆ پەڕەسێلکە و کونەپەپۆ دەگۆڕێت. لە ڕۆمانی «کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان»یشدا، بەردەوام کارەکتەرەکان لە دۆخێکەوە دەچنە دۆخێکی تر و گۆڕانی لەناکاو بە خۆیانەوە دەبینین، کە بەدگۆڕانە



لەناکاوەکان هۆکاری سەرەکیی ئەو گۆڕانانەن. لە ڕۆمانی «کازینۆی منداڵان»دا مانگا هەم وەك کارەکتەرێکی ئەکتیڤ دەردەکەوێت و هەم گوزارشتە لە دیوی نائاگاییی چەند کارەکتەرێك. مانگا هەم لەناو ئەفسانەکان و هەم لە مێژووی مرۆڤدا خاوەن چەندین وێنە و هێمای جیاوازە. بۆ ئەوەی بتوانین قسە لەبارەی سایکۆلۆجیای کارەکتەرەکانەوە بکەین، پێویستە پاڵنەری شاراوەی ڕووداوەکان بخەینە بەر باس. بۆ نموونە مردن یان کوشتنە تەمومژاوییەکەی «ئارۆن» نزیکمان دەکاتەوە لە مەرامە شاراوەکانی «وریا». «ئارۆن» وەك باوکێك وایە بۆ «وریا» یان شوێنی باوکی لە ماڵدا بۆ گرتووەتەوە. لە شوێنێکدا «وریا» ئارەزووی کوشتنی «ئارۆن» دەکات. پێ دەچێت «ئارۆن» خۆی کوشتبێت، بەڵام «وریا» هەم خۆی گومان لە خۆی دەکات و هەم کەسانی دەورووبەریشی.

ئەوەیان پێوەندیی بە ویستی کوشتنی باوك و چوونە نێوجێگاوە هەیە لەگەڵ دایکیدا، چونکە وەك دەبینین «مارینا» شوێنی دایك بۆ «وریا» دەگرێتەوە. وریا بۆ ئەوەی باوەڕ بە خۆی بهێنێت، کە ویستی کوشتنی ئارۆنی نەبووە، لە دوای مردنیدا خۆی دوور دەگرێت لەوەی بکەوێتە ژێر کاریگەریی گرێ ئۆدیپییەکەی، بۆیە پەنا بۆ شوێنی سۆزانییەکان دەبات. مارینا و ئارۆن دایك و باوکە هێماییەکەی وریان، بەڵام با بێین قسە لەبارەی کوشتنی باوکی ڕاستەقینەی وریاوە بکەین لە لایەن موفیدەوە. موفید لە دانیشتنێکی مەیخواردنەوەدا گۆرانی بەسەر «پەریهان»ی دایکی وریادا هەڵدەڵێت و بەو هۆیەوە لەگەڵ هاوسەری پەریهان دەبێتە شەڕیان و لە ئەنجامدا هاوسەری پەریهان، کە دەکاتە باوکی وریا لە لایەن موفیدەوە دەکوژرێت. «موفید» پاش ئازادبوونی لە زیندان، دەیەوێت لەگەڵ وریا قسە بکات، بەڵام وریا نایەوێت بۆ ئەو زەمەنە بگەڕێتەوە، گوایە تێیپەڕاندووە. لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە وریا نایەوێت لەگەڵ موفید قسە بکات، چونکە هەر خۆی ویستی کوشتنی باوکی هەبووە. لای زۆربەی ڕەخنەگرانی ئەدەبی سەخت بوو هۆکارێك بۆ دواکەتنی تۆڵەکردنەوەکەی «هاملێت» بۆ باوکی، کە لە لایەن مامیەوە کوژرا؛ بدۆزرێتەوە. بەڵام سایکۆلۆجیا ئەو هۆکارەی دۆزییەوە. هاملێت هەمان ویستی مامی هەبوو بۆ کوشتنی باوکی، بە هۆی گرێی ئۆدیپییەوە، بۆیە تا ماوەیەکی زۆر هاملێت لە ئازاری ویژدانیدا دەژیا، بەوەی خۆیشی دەیویست



ئەو کارە بکات، کە مامی کردوویەتی. دیارە دەروونشیکاری شیکردنەوەیەکی نەستیانە یان نائاگاییانە بۆ ئەو ڕووداوانە دەکات. بە هەمان شێوە وریا نایەوێت بکوژی باوکی خۆی ببینێت، چونکە خۆیشی بە شێوەیەکی ناخودئاگا بکوژی باوکیەتی و ویستی ئەوەی هەبووە بچێتە جێگەی دایکیەوە. کەواتە لای کاروان هەمووومان بە شێوەیەکی ناخودئاگا ئەگەر بکوژیش نەبین، ویستی کوشتنمان هەیە. کاروان دەیتوانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەو ڕەهەندە بەرجەستە بکات، بەڵام وەکو گوتمان ئەدەبی ئەدەبی، ناڕاستەوخۆی ناڕاستەوخۆیە. هەر خۆی باسکردنی تاك لە ڕۆماندا کارێکی تەحداکەرانەیە (Challengeable) ، چونکە تاك ئەوەیە، کە مێژووی هەڵسووڕاندووە، ئەوەیە، کە ئێستا هەیە، ئەوەیە، کە لە ئاییندە دەبێت. دەشێت دیاردەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت، بەڵام تاك لە ئەنجامدا هەر تاکە. بۆیە هەموو پرۆسێسەکان لای کاروان، دەرکەوتەی جیاوازن بۆ گوزارشتکردن لە تاك. دەتوانم بڵێم هەموو ئەو ڕووداوانەی لەو ڕۆمانەدا ڕوو دەدەن، وێنەن بۆ پێشاندانی سایکۆلۆجیای تاك و دەرکەوتە جیاوازەکانی. هیچ ڕۆماننووسێك ناتوانێت وێنەیەکی جیاواز بەرهەم بهێنێت، ئەگەر باکگراوندێکی تایبەتی لە ڕەهەندە سایکۆلۆجییەکانی تاك بەرانبەر بە تاك نەبێت. لای کاروان تاك ناکەوێتە ناو دوالیزمی شەیتان و فریشتە، لاواز و بەهێز، ترسنۆك و ئازا و...

شتی دیکەوە، بەڵکو تاك وەك بوونەوەرێکی فرەڕەهەند مامەڵەی لەگەڵ کراوە. کاروان بەرگێکی ئەفسانەیی بە کارەکتەرەکانی نەداوە، بەڵکو کارەکتەرەکان زادەی واقیعن. بەشێکی زۆری ئەدەبی دوای ڕاپەڕین پڕن لە زیندووکردنەوەی دوالیزمی شەیتان و فریشتە، چاك و خراپ، ئەمەیش وای کردووە کەمترین فرەدەنگی و جیاوازی لەنێوان کارەکتەرەکاندا هەست پێ بکرێت. بەو هۆیەوە ناتوانین سەرنجی ڕەهەندی سایکۆلۆجیی قووڵی ئەو کارەکتەرانە بدرێت، چونکە ئەو ڕەهەندانە لە کارەکتەری یەکلاکەرەوەدا بەرجەستە نابێت. مەبەستمان لە یەکلاکەرەوە ئەوەیە، کە ئێمە بزانین کارەکتەر شەیتانە یان فریشتە، جەللادە یان قوربانی. پێچەوانەی ئەوە لە ئەدەبی کارواندا بەرجەستە بووە. بۆ نموونە ئەو ڕەهەندە لە ڕۆمانی کەناڵی مەیموونە چەکدارەکانیش بەرجەستە بووە. ئەویش کاتێك «سۆزان» لە گۆڕستان، بەردێك دەگرێتە پیاوێك و دەیکوژێت. ناتوانین بڵێین سۆزان جەللادە، بگرە تۆمەتبارکردنیشی جێگەی گومانە. تەنانەت زۆر جار ڕەگەزی کارەکتەرەکانیش دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، ئایا نێرن یان مێ، کە



ئەمە ناوەکانیشیان دەگرێتەوە. ئایا «ئاواز»ی ڕۆمانی کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان کوڕە، یان کچ؟ خاڵێکی تر پێوەندیی بە کوڕەکانی «پەلکشان»، یان «پەلکۆ»وە هەیە. «پەلکشان» دەیەوێت منداڵەکانی بە شێوەیەکی جیاواز پەروەردە بکات. مەبەستی ئەو لەوەدا دروستکردنی منی باڵایە (Transcendental Ego)، بەڵام کاتێك کوڕەکانی گەورە دەبن، ئەو منی باڵایە ڕووبەڕووی پەرتەوازەبوون دەبێتەوە، کە ئەوەیان یەکێکە لەو هۆکارە سایکۆلۆجیانەی بەربەستن لە دروستبوونی منی باڵادا. تا ڕادەیەك سەرهەڵنەدان یان دروسبوونی ئیگۆی باڵا لە کورددا پێوەندیی بەو هۆکارەوە هەیە.

لە ڕووی فینۆمینۆلۆجییەوە، لە ئەزموونی کارواندا بەردەوام ڕووبەڕووی دەیان ڕەهەندی جیاواز دەبینەوە، کە دیاردەکان لە یەککاتدا هەم کارلێك لەگەڵ شتەکانی دەورووبەریان دەکەن و هەم دابڕان لەگەڵ خۆیاندا دەخوڵقێنن. پرۆسێسی لەیەکتربوون و کارلێککردن لای کاروان هەمان پرۆسێسی بە گریمانکردنی شتەکانی دەوروبەرمانن. شتەکانیش ڕوویەکی سیمبۆڵییان هەیە بۆ دەرخستن و شاردنەوەی ماهیەتی دیاردە. لەو جیاوازییەی نێوان شاردنەوە و خۆدەرخستنندا، ڕووبەڕووی دەیان ئاڕاستەی جیاواز دەبینەوە، کە بە گریمانە و پێشبینیی جیاوازمان دەبەستێتەوە. هاوکات ئەدەبی گێڕانەوە کەناڵێکی گونجاوە بۆ ئەو ململانێیە، چونکە لە گێڕانەوەدا کەمترین جار بەر وەستان دەکەوین، بەڵکو هەمووهەوڵێك بۆ بەردەوامبوونێکی نادیارە. ئەوەی لەو ڕۆمانەیش تێبینی دەکرێت بریتییە لە پرۆسێسی بەردەوامبوون بەبێ بوونی پلانێکی دیاریکراو. دەتوانرێت تێبینیی بکرێت، کە کارەکتەرەکان دەژین و بەردەوامن، بە بێ ئەوەی زەمەنێکی دیاریکراومان هەبێت. زمان لێرەدا نەك تەنیا ماڵی بوونە، بەڵکو خودی بوون خۆیەتی. گێڕانەوە لێرەدا یەکسانە بە دەستپێکردنی ژیانی کارەکتەرەکان. لە گێڕانەوەیەکدا کارەکتەر دەخوڵقێت و لە بەردەوامیی ژیاندا زەمەنی کارەکتەرەکان کۆتایی پێ دێت. کارەکتەرەکان هەر بەو شێوەن، کە هەن. لە کاتی خوێندنەوەی ئەفسانەی «ئۆدیپ»ی گریکی، یەکێك لەو پرسیارە سەرەکییانەی، کە بەردەوام ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە، کە ئەگەر ئۆدیپ بۆ تبس نەگەڕابایەوە، ئایا باوکی



خۆی دەکوشت و لەگەڵ دایکی هاوسەرگیریی دەکرد؟ ئۆدیپ لە لایەن فیکلیکسەوە پێی دەگوترێت، کە نەگەڕێتەوە بۆ تبس، چونکە باوکی خۆی دەکوژێت و هاوسەرگیرییش لەگەڵ دایکی دەکات. لێرەدا ئۆدیپ ئەو ڕاستییەی دەزانی، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی گەڕایەوە؟ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە پێوەندیی بە پلۆتی ئەفسانەکەوە هەیە.

هەر دەبووایە ئۆدیپ لە دایك ببێت بۆ ئەوەی باوکی بکوژێت و لەگەڵ دایکیشی هاوسەرگیری بکات. کارەکتەرەکانی کاروان چ لەم ڕۆمانە و چ لە چیرۆك و ڕۆمانەکانی دیکەیشیدا جگە لەو فۆڕم و شێوە ژیانە، جگە لەو ڕووداو و چارەنووسە، هیچ ڕێگەیەکی دیکەیان نییە بۆ ژیان. «وریا» ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ هەولێر و «مارینا» ناتوانێت بچێت بۆ بەغدا تاکو نهێنییەکەی پێ بڵێت، بۆیە ئەوە تاکە هەڵبژاردنیانە و لەوە زیاتر هیچ ڕێگەیەکی دیکە نییە بۆ گوتنی نهێنییەکە. لە ئەنجامدا نە ئێمە دەزانین ئەو نهێنییە چییە و نە وریاش. ئەگەر لاکانییانە ئەو ڕووداوە لێك بدەینەوە، دەڵێن نەزانینی نهێنییەکە نیشانەی ناوشیاریی خۆیەتی. نە

خوێنەران و نە وریاش دەزانن ئەو نهێنییە چییە، بەڵام کاریگەرییشی هەیە. پرۆسێسی دروستبوون و ونبوونی کارەکتەرەکان ئاڕاستەی ئیشکردنی کاروانە. دووبارە «لاکان» دەتوانێت یارمەتیدەرمان بێت بۆ لێکدانەوەی ئەو پرۆسێسە. ئەویش بریتییە لە دۆزینەوە و ونبوونی سەبجێکت لە یەککاتدا. لای «لاکان» زمان بریتییە لە دۆخی بوونی ئۆبجێکت بە سەبجێکت. ونبوون دۆخێکی ناوشیارانەیە. بەڵام لای کاروان ئەو دۆخە هەر تەنیا پێوەندیی بە نەمانی زمانەوە نییە، بەڵکو پێوەندیی بە ململانێی زەمەنیشەوە هەیە. ئەوە ئەگەر زانیمان هایدیگەر گوتەنی بوون و زەمەن هەر یەك شتن. کارەکتەرەکان ون دەبن، چونکە زەمەنی ئەوان کۆتاییی هاتووە.

کارەکتەرەکان لە شەڕێکی گەورەدان لەگەڵ زەمەندا. ناونیشانی ڕۆمانەکەیش بەشێك لەو نهێنییەی لە خۆوە گرتووە، کە ئەویش ڕووبەڕووبوونەوەی زەمەن و شوێنە. «منداڵان» ئاماژەیەکی ناوشیارانەیە بۆ زەمەن و «کازینۆ»یش هێمایەکە بۆ شوێن. زەمەن لێرەدا بوونە، بوونی کێشە لەگەڵ زەمەن یەکسانە بە هەبوونی کێشەی وجودی.

کێشەی کارەکتەرەکان لەگەڵ زەمەن مانای بەدیەتیی کات ناگەیەنێت، وەك ئەوەی گازاندەی ئەوە بکەن لە زەمەنێکی



بەدەوە هاتوونەتە دنیاوە، بەڵکو بوونی ئەوان یەکسانە بەو زەمەنە بەدە. کێشەی سەرەکیی کارەکتەرەکان بەیەکدادانیانە لەگەڵ دەرکەوتەی جیاوازی زەمەندا. هەموو شتەکان دێن و دەڕۆن، کارەکتەرەکان هەمیشە ترسی لەدەستدانی خۆیان و شتەکانیان هەیە. زمانی کارەکتەرەکان ناسەقامگیرە. لەوپەڕی خۆشبەختییانەوە چاوەڕێی بەدبەختین. کاروان لەو ڕۆمانە و کارەکانی دیکەیشدا نووسەری ڕووداوە لەناکاوەکانە. گێڕانەوە دروستکردنی ماڵی سەقامگیری نییە هێندەی وێناکردنی تێکدان و وێرانکردنی کارەکتەرەکانە. زمان یەکسانە بە بوونی کارەکتەرەکان، بوونی کارەکتەرەکانیش بریتییە لە ڕۆڵگێڕانیان لە زەمەن و شوێندا بە هەموو دەرەکەوتە و دیاردە جیاوازەکانەوە. ئەو ڕووداوانەی بەسەر کارەکتەرەکاندا دێن، لە بێدەستەڵاتیی خۆیانەوە نییە، بەڵکو بەشێکیان خۆیان بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆیان دەدەن. وەك ئەوەی «تیشکەشان» دوای پەنجاوسێ ساڵ ژیانی هاوسەرگیری لە هاوسەرەکەی جیا دەبێتەوە و بۆ نادیار سەری خۆی هەڵدەگرێت. ئیرادەی بڕیاردان بۆ کارەکتەرەکان پانتاییەکی گەورەی لەو ڕۆمانەدا پێ بەخشراوە. ویستی لەدەستدان بونیادێکی سایکۆلۆگی لای کارەکتەرەکان هەیە. ئەوان شت و کەسەکانیان لە دەست دەدەن، تاکو هەست بەوە بکەن، کە هەن. دیاریکردنی شوێن بۆ نموونە هەولێر، دروستکردنی شارە لەناو شاردا. کاروان هەولێرێك وێنا دەکات، کە لە یەك کاتدا هەموو شێوە ڕاستەقینەکان هەڵدەگەڕێنێتەوە و بونیادیان دەنێتەوە. شار زەمینەیەکە بۆ کارەکتەرەکان تاکو خۆیان لە هەموو ئینتیمایەکی خێڵەکیانە دابڕن. بەڵام کەلتووری شاریش بە تەواوەتی ناتوانێت شێوەژیانێکی ئازاد بۆ تاك فەراهەم بکات. ئازادی و فرەدەنگی زادەی کەلتووری شارن، بەڵام تارماییەکانی خێڵ، لە بەرگی جیاوازدا خۆیان دەردەخەن. بۆیە لەو ڕۆمانەدا شاری کوردی هەمیشە تارماییەکانی خێڵ و ئایدۆلۆجیای ترادیسیۆنییان بەسەرەوەیە. ئەو هاوکێشەیە لەو ڕۆمانەدا خۆی لە شاری کەرکووك و سلێمانیش مانیفێست دەکات. بە پێچەوانەوە بەغدا لەگەڵ فۆرمێکی دیکەی شاردا لە ململانێ دایە، ئەویش لەخۆگرتنی پێکهاتەی جیاوازە لەو زەمەنەدا. دەتوانین بەغدا وەکو شارێکی فرەکەلتوور (multicultural) ببینین، بەڵام بە هۆی ئەوەی کۆمەڵێك ململانێی مێژوویی (historical conflict)ەوە ڕووی



ئەو شارە گۆڕانێکی لەناکاو بە خۆیەوە دەبینێت. لەو ڕۆمانەدا بەغدا سێنترالّی ململانێی نەتەوەیی و کەلتوورییە. لەو کاتەوە بەغدا دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی لەدەستدانی شوناس، کە چەوساندنەوەی کەلتووری (persecution cultural) دەبێتە هۆی خستنەوەی کرداری توندوتیژی و جینۆساید، وەکو کوشتن و دەرکردنی بە کۆمەڵی جوولەکەکان. دیارە ئەو باسە بە شێوەیەکی دیکەیش لە ڕۆمانی «مامزێر»دا بەرجەستە بووە. کاروان بەردەوام ئیشی لەو ململانێیە کەلتووری و مێژووییانەدا کردووە، بەڵام لەم ڕۆماندا ئەو وێنانە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دروست دەکاتەوە. ئەو خاڵەیان پێوەندیی بە نەستی گشتی (common unconsciousness)یەوە هەیە. واتە لە نەستی گشتیدا، ململانێی درێژخایەن و کەلتووری خۆیان حەشار داوە، بەڵام ئەو ململانێیانە زۆر جار بە بێ ویست ڕوو دەدەن، چونکە بیرمان نەچێت لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە کردارە نەستییەکان، ئەو کردارانەن، کە بە شێوەیەکی خۆنەویست لەنێوماندا بوونیان هەبووە. بۆیە لەم ڕۆمانەدا دەبینین چەوساندنەوەی نەتەوەیی و کەلتووری، ئەگەرچی ڕەگێکی مێژوویی دێرینیان هەیە، بەڵام زادەی نەستی گشتیی کەلتوور و مێژوون.

بە درێژایی مێژووی ئەو چەند سەدەیە، بەغدا شاری کۆبوونەوەی کەلتوورە جیاوازەکان بووە. شارێکە دەتوانین بڵێین هەم شوناسی هەیە و هەم بێشوناسە. بۆیە هەر گۆڕانێك لەو ناوچایەدا، تاکو کار لە بەغدا نەکات، کاریگەرییەکانی نابینرێن. ڕووخانی ڕژێمی بەعس یەکێکە لە دیارترین نموونەکان. بە ئێستایشەوە گرەوی سەرەکی لەسەر شاری بەغدایە، چونکە بونیادی کەلتووری و مێژوویی ئەو شارە وای کردووە ببێتە خاڵی هاوسەنگ بۆ قەیرانە کەلتووری و مێژووییەکان. لەو ڕۆمانەدا پێوەندیی کەلتووریی نێوان سێ شار بەرجەستە کراوە، ئەوانیش هەولێر، کەرکووك و بەغدان. دەکرێت بڵێم کەرکووك سێنترالّی پێوەندییە لەنێوان هەولێر و بەغدادا. دیارە بە خوێندنەوەیەکی مێژوویی و کەلتووری بۆ پێکهاتەی ئەو سێ شارە زیاتر دەتوانین ڕەهەندەکانیان بدۆزینەوە و چۆنیەتیی بەرجەستەبوونی ئەو پێوەندییە مێژوویی و کەلتوورییە لەو ڕۆمانەدا باس بکەین، بەڵام ئەوەیان باسێکی دیکە و پێویستی بە قووڵبوونەوەی زیاترە لە بونیاد و پێکهاتەی ئەو سێ شارەدا. بە شێوەیەکی گشتی لەو ڕۆمانەدا کاروان بە چڕی ئیشی لەسەر عێراقدا کردووە. سێ کەلتوور پانتاییەکی



بەرفراوانیان لە ئەدەبی کارواندا داگیر کردووە، ئەوانیش کەلتوور و مێژووی سێ نەتەوەن: «کورد، عەرەب و جوولەکە». کەلتوور و ململانێی ئەو سێ نەتەوەیە نەك تەنیا بۆ خۆرهەڵات، بەڵکو بۆ جیهانیش مەتەڵێکی هەڵنەهێنراوە. جیهان دەمێکە بە ململانێی مێژوویی نێوان عەرەب و جوولەکە ئاشنایە، تا ئەو ئاستەی ئەو دوو ململانێیە کێشەی جیهانین. بەڵام باسەکە لەبارەی کوردەوە گۆڕانکاریی بەسەردا دێت. کێشەی کورد لەناوەوەدا ئاڕاستەی جیاوازی لێ دەبێتەوە. وەکو گوتمان کاروان بە چڕی ئیشی لەسەر تاکی خۆرهەڵاتی کردووە. هەر بەو شێوەیە ئەو ئاڕاستە جیاوازانەی، کە پێوەندییان بە کوردەوە هەیە، بەرجەستە دەکات. تاکی کورد تاکێکی پەرتە. هەمیشە لە هەوڵی ڕەتکردنەوەدایە، بەڵام لە بنچینەدا نازانێت بۆچی هەوڵ دەدات. تاکی کورد خاوەن جێگرەوەیەکی کەلتووریی بەهێز نییە. ئەو کەللەڕەقییەی لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا بەرجەستە کراوە، ئاماژەیە بۆ سایکۆلۆجیای تاکی کورد. ئەوەی وای کردووە ئەو کارەکتەرە بە هاوبەشی لەگەڵ عەرەبەکان لە جەنگدا بەشدار بێت، نەبوونی ئەڵتەرناتیڤێکی کەلتوورییە، بەڵام لە نائاگاییدا خەسڵە سایکۆلۆجییەکانی تاکی کوردی هەڵگرتووە. مانەوەی عەرەب وەك کەلتوور، بەشێکی پێوەندیی بەو پاشخانە مێژووییەوە هەیە، کە بە شێوەی جیاواز پەرەی بە کەلتووری ئەوان داوە. دین، یەکێکە لەو هۆیەی، کە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ پەرەی بە کەلتووری عەرەب داوە. تاکی کورد بە هۆی بوون بە بەشێك لە ئۆبجێکت بۆ پەرەپێدانی ئەو کەلتوورە، ئەوا نە دەتوانێت بە تەواوەتی شوێنی خۆی لەو کەلتوورەدا بکاتەوە، نە بە تەواوەتی لە گرێیە سایکۆلۆجییەکانی دەربچێت. مادام ململانێی کێشەکان عێراقە، ئەوا دەبێت هەڵوێستەیەك لەسەر دروستبوونی مێژووی عێراق بکەین. ساڵی ١٩٢٢ بەریتانییەکان بۆ کۆتاییهێنان بە ململانێیە کەلتووری و سیاسییەکان، دەوڵەتێکی مۆدێرن لە خۆرهەڵات دروست دەکەن، کە ناوی عێراقە. مەلیك فەیسەڵ ناوێك لە سعودیە دەهێنن، کە لە بنەماڵەیەکی دینییە. بەو هەڵبژاردنە، بەریتانییەکان دەیانەوێت هەناوی کۆمەڵگای عێراق بجووڵێنن و زیاتر خۆیان بسەپێنن. دەوڵەتە دەستکردەکەی بەریتانیا بە کۆمەڵێك ململانێی جیاواز گوزەر دەکات، بەڵام هێشتا ئەو ململانێیانە کۆتاییان نەهاتووە، لە دەوڵەتێکی دیکەی



مۆدێرن لە خۆرهەڵات دروست دەبێت، ئەویش ئیسرائیلە. دروستبوونی عێراق بەشێکی پێوەندیی بە چارەسەکردنی کێشەی کورد و عەرەبەوە هەیە، لە هەمانکاتدا مەبەستی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل لە هەمان مەبەستی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە نزیکە، ئەویش کۆتاییهێنانە بە ململانێی مێژوویی عەرەب و جوولەکە. لێرەدا سێگۆشەیەکی مێژوویی و جیۆپۆلەتیکی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دروست دەبێت. ئەو سێگۆشەیە زادەی ململانێی درێژخایەنی ئەو سێ نەتەوەیە یان کەلتوورەیە. هەمیشە دەستی خۆرئاوا ڕۆڵێکی گەورەی لە هەڵسوڕادنی ئەو دوو دەوڵەتەدا بینیووە. دیارە مەبەستمان لە دەست تێخستن (Intervene) ە. بەڵام ئەوەی خۆرئاوا نەیتوانیوە بیگۆڕێت یان خاوەنی خوێندنەوەیەکی گونجاو نەبووە بۆ خۆرهەڵات، هەناوی کۆمەڵ و تاکی خۆرهەڵاتییە. کاکەسوور لەو ڕۆمانەیدا دەستی بۆ ئەو خاڵە بردووە و ململانێکانی ئەدەبییانە بەرجەستە کردووە. ئیشکردن لە هەناوی کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵات، ئەو مەودایەیە، کە بووەتە هۆی ئافراندنی ئەو ململانێیانە، تەنانەت چەوساندنەوەی ئایینی و نەتەوەییش بەو هۆیەوە بووە. پارادۆکس ئەوەیە خۆرئاوا چەندە ئاگای لە ململانێکانی خۆرهەڵاتی

ناوەڕاست بووە و زۆر جاریش بکەری ڕووداوەکان بووە، بەڵام بکەری ڕاستەقینە نییە و خاوەنی کاریگەرییە گەورەکە نەبووە لە بەشداریکردن لە ململانێ و چەوساندنەوە ئایینی، کەلتووری، مێژوویی و نەتەوەییە جیاوازەکان، چونکە هۆکارە بنچینەییەکان لە قووڵایی هەناوی کۆمەڵ و تاکی خۆرهەڵاتی خۆی دایە، وەك ئەوەی لەو ڕۆمانەدا بە سێکوچکەی کورد، جوولەکە و عەرەب بەرجەستە بووە. بۆیە ئەو ڕۆمانە سەرچاوەیەکی گرنگی سیاسی ـ کەلتوورییشە بۆ تێگەیشتن لە تاکی خۆرهەڵات و هۆکاری شاراوەی ململانێی جیاوازەکانی ئەو ناوچەیە.
خاڵێکی دیکە پێوەندیی بە شارەوە هەیە. یەکێك لە کێشە ئۆڕێنتاڵی یان خۆرهەڵاتییەکان، نەبوونی شوناسی شاری خۆرهەڵاتییە، چونکە شوناسی شاری خۆرهەڵاتی لەژێر پرسیاردایە، نەك لەبەر ئەوەی وا بزانین شار نین، بەڵکو لە شوناسی شار جیاوازن. لێرەدا ئێمە دەبێت خاوەنی پێوەرێکی خۆرهەڵاتی بین بۆ شار. خۆرهەڵات، دیارە مەبەستمان خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، لە نەبوونی شوناس بۆ شار، لە زۆر ڕووداوی مێژووییدا کەوتووەتە بەردەم پرسیاری جەوهەرییەوە. ئایا لێرەدا ئەدەب چۆن دەتوانێت دیدگا یان شوناس



بۆ شار دابهێنێت؟ لە ڕۆمانی کازینۆی منداڵان دا شاری کوردی ناسنامەی دراوەتێ. ئەوەشیان لە ڕێگەی مامەڵەکردن لەگەڵ شوێن و شێوازی ژیانی کارەکتەرەکان. دەتوانین بڵێین ئەو هەولێرەی لەو ڕۆمانەدا هەیە، شارە، بەڵام تەواو جیاوازە لەو هەولێرەی، کە لە واقیعدا هەیە. کاکەسوور لە یەککاتدا وێنەیەکی جیاواز و هاوشێوە بە شار دەبەخشێت.

کاروان شار وەك شار وێنا دەکات، نەك وەك پێکهاتەیەکی جیاواز. دەتوانم بڵێم لەو ڕۆمانەدا بەر ناسنامەی شاری کوردی دەکەوین، ئەوانیش هەولێر، کەرکووك و سلێمانین. هەولێر، لەنێوان دۆخی مانەوە و لەدەستداندایە. کەرکووك، وابەستەیە بە پێکهاتەی ئاڵۆز و جیاواز لە خۆیدا. سلێمانی، شارێك هەست دەکەین لە ناوەوەیدا پەی پێ دەبەین، بەڵام لەناو خۆیدا بوونی نییە، کەچی لە دەرەوەشدا بێناوەرۆك نییە. کارەکتەرەکان شارنشینن، لە دەرەوەی هەر ئینتیمایەکی دیاریکراودان. بۆیە هەمیشە هەست بە خەمێکی شارستانیانەیان دەکەین، کە سەرچاوەکەی لە دروستبوونی شارەوە هاتووە. کاتێك کارەکتەرکان ڕووبەڕووی کەلتوورێك دەبنەوە، کە تایبەت نییە بە شار، ئەوا ناتوانن خۆیانی لەگەڵ بگونجێنن. هەر بۆ نموونە «تیشکەشان» تەڵاق دەدرێت، چونکە لە بەرچاوی میوانەکان گۆرانیی گوتووە. ئەمە لای کەسوکاریان جێگەی قبووڵ نییە، چونکە کۆنەپارێزن. «سوهاد»یش زادەی ئەو کەلتوورەیە، کە ڕووبەڕووی زۆرترین بەیەکدادان دەبێتەوە لەگەڵ دیاردە جۆراوجۆرەکانی شاردا. ڕووداوێکی تر ئەو کاتەیە، کە «خەلۆ چاوسوور» دەستدرێژیی سێکسی دەکاتە سەر کچێك. لەو ڕووداوەدا ئێمە لە یەککاتدا هەم دیوێکی واقیعی شار دەبینین و هەم دژەکەی شاریش هەست پێ دەکەین، ئەو پێیەی ئەو ڕووداوە زادەی کۆمەڵگەی شارە و هەم لەگەڵ کۆمەڵگەی شار ناکۆکە. ئەگەر سەرنج لە بەشێکی زۆری ئەدەبی گێڕانەوەی کوردی بدەین، دەبینین شار شوێنی نامۆبوونی کارەکتەرەکانە، بە مانایەکی دیکە کارکتەرەکان ویستی گەڕانەوەیان بۆ گوند زیاتر تا ژیان لە شار. بەڵام کارەکتەرەکانی کاکەسوور هەست بە بچووکی شار دەکەن بۆ ژیان. لەبەر ئەو هۆیەیە، کە هەندێك لە کارەکتەرەکان سەر هەڵدەگرن. لەو ڕۆمانەدا سەرهەڵگرتینی هەر یەك لە «باوکی سوهاد، خەلۆ چاوسوور، وریا، تیشکەشان» نموونەیەکن بۆ ئەو



باسە.
هەر دیاردەیەك لەو ڕۆمانەدا چیرۆکی تایبەت بە خۆی هەیە. وەکو چاوە سوورەکانی «خەلۆ چاوسوور». لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت پلۆتی ئەو ڕۆمانە لە ئاستێکی بەرزدایە، چونکە بە ئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ دیاردە جۆراوجۆرەکاندا کراوە. بەڵام شاری کوردی زادەی کەلتووری کوردی خۆیەتی.  کاروان ئەو لایەنە بە لاوە نانێت، کە شار لە گشت ڕەهەندە کەلتوورییەکان دابېڕێت، بەڵکو بە دیوێکی دیکە وێنای دەکات.
 لەو ڕۆمانەدا کازینۆ ئەو شوێنەیە، کە کارەکتەرەکان بە بێ بوونی پلانێکی پێشوەخت یەکتر دەبینن و گوزارشت لە خۆیان دەکەن. بە بڕوای «باختین» ڕۆمان کەناڵی فرەدەنگییە و دەنگەکانی ناو کۆمەڵگا دەهێنێتە ناو ئەدەب. لێرەدا کارەکتەرەکان گوزارشت لە باکگراوندی کۆمەڵایەتی و دەروونیی خۆیان دەکەن. کازینۆی منداڵان، وەکو ڕۆمانی کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان دابڕانێکی دیکەیە لە ئەزموونی کاروان بە تایبەتی و ئەدەبی گێڕانەوەی کوردی بە گشتی. ئەو ڕۆمانە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ توێژینەوەی خۆرهەڵاتی. بۆیە وەرگێڕانی ئەو ڕۆمانە بۆ زمانە زیندووەکان، بە تایبەت ئینگلیزی و عەرەبی، پڕۆژەیەکی گرنگە، چونکە ئەدەب کەرەستەیەکی هەرە گرنگە بۆ میتۆدی زیندووی توێژینەوە، وەك ئەوەی ئێدوار سەعید لە کتێبی ئۆرێنتالیزم دا بە کاری هێناوە و بەرجەستەی کردووە. ڕۆمانی کازینۆی منداڵان ناکرێت تەنیا لە چوارچێوەی زمانی کوردی یان ئەدەبی کوردیدا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو وەك ڕۆمانێکی خۆرهەڵاتی شوێنی خۆی دەگرێت.
لێرەدا جێگەی خۆیەتی بپرسین بۆچی ئەدەبی ئێمە نەیتوانیوە وەك ئەدەبێکی خۆرهەڵاتی بناسرێت؟ ئایا هۆکارەکەی ئەوەیە، کە نووسەری قووڵمان نییە؟ وەڵامەکە بە تەواوەتی پێوەندیی بە ڕەخنەوە هەیە. ئایا کامانەن ئەو کەرستانەی ئێمە هەمانە بۆ خوێندنەوەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆمان؟ ئایا بۆچی کاتێك ڕووبەڕووی ڕۆمانێك دەبینەوە، کە دابڕانی لەگەڵ کارەکانی پێش خۆی دروست کردووە، ڕاستەوخۆ خەیاڵمان بۆ ڕەتدانەوە دەچێت؟ بۆچی ڕەخنەگران، نووسەران و بەشێك لە خوێنەرەکانمان لە گۆڕان دەترسن؟ بۆچی دەترسن بەرهەمێکی ئەدەبی لە بەرهەمێکی دیکە نەچێت؟ ئەم گوتارەم هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ کردنەوەی بەشێك لە کۆدەکانی ئەو ڕۆمانە. لە خوێندنەوەی ڕۆمانی کازینۆی منداڵان دا.





بۆمان دەردەکەوێت بە تەواوەتی لە بەردەم کارێکی ئەدەبیی جیاواز داین. کاروان کاکەسوور وەك ڕۆماننووسێکی قووڵ بە چڕی و بە وردی ئیشی لەو ڕۆمانەدا کردووە. کاکەسوور چیتر لەو نووسەرانە نییە بتوانین بە ئاسانی و بە زارەکی قسەی لەبارەوە بکەین. کارەکانی ئەو پێوستیان بە لێوردبوونەوەی قووڵ و چڕ هەیە، چونکە ئەو لە ئاستێکدا دەنووسێت، کە تەواو دابڕانی لەگەڵ زمانی باو و ئەدەبی پێش خۆی دروست کردووە، بۆیە بۆ خوێندنەوەی کارەکانی ئەو، سەرەتا پێویستیمان بەوەیە بەراوردێك لەنێوان زمانی ئەو و زمانی باودا بکەین.



# دوو چیرۆك

## بۆ دوو چیرۆك و دوو چیرۆكنووس؟

لە ژمارە دووی گۆڤاری ئەدەبی سەردەمەوە هەر جارەی داوا لەیەکێک لە چیرۆکنووسە دیارەکانی ناو دنیای ئەدەبی کوردی ئەکەین، کە یەکێک لە باشترین و خۆشەویسترین چیرۆکی خۆیمان بۆ بنێرێت، لەگەڵ چیرۆکی چیرۆکنووسێکی تردا کە لە یەکێک لە هەستیارترین قۆناغەکانی نووسینیدا کاریگەری گەورەی لەسەر بیرکردنەوە و ئەزموونی داناوە؛ لە هەمان کاتدا داواش لەو چیرۆکنووسە کوردە ئەکەین کە خۆی وەک نووسەرێک بۆمان بنووسێت کە بۆچی ئەم چیرۆکەی خۆی لەناو هەموو چیرۆکەکانی تردا بەتایبەت و سەرکەوتوو ئەزانێت، لەهەمانکاتیشدا هۆکاری هەڵبژاردنی ئەو چیرۆکەی چیرۆکنووسەکەی تریشمان بۆ باسبکات. ڕەنگە ئەم باسکردنە هەندێک نهێنی لەگەڵ خۆی بهێنێت و هەندێک جاریش لەگەڵ تێڕوانینی ڕەخنەگراندا یەکنەگرێتەوە، بەڵام دیدێکی ئینسانی تر و خوێندنەوەیەکی ترمان ئەخاتە بەردەم کە ڕەنگبێت ئێمەش وەک خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەی ئەو بابەتانەدا درکی پێنەکەین؛ دیارە ئەم پرۆسەی بەقسەخستنەش هەم ئێمە زیاتر ئاشنای ئەزمونی هونەریی و ئینسانی ئەو چیرۆکنووسە ئەکات، هەم ئەم کارەش ڕەنگە هێندەی خودی بەرهەمە نووسراوەکە سود بە پرۆسەی نووسین و خوێندنەوە بگەیەنێت.

# جاك لەندەن

## عەتا موحەمەد

لەو باوەڕەدام هیچ تێکستێک نەبێت، کۆی دنیابینی و پرسیارەکانی نووسەرێک بەدەربخەن. ئەگەرچی دەشێت بەشێک لەدنیابینی و پرسیارەکانی نووسەر لەخۆی بگرێت. نووسەر لە پرۆسەیەکی دابەشبوونی بەردەوامدایە، بەومانایەی لەگەڵ نووسینی هەر دەقێکدا، نووسەر چەند بەسەر دنیای تر و پرسیاری تردا دەکرێتەوە، هێندەش تووشی دابەشبوون دەبێت. ئەزموونی نووسینی کەسێک، چەند وا بەدەردەکەوێت پرۆسەیەکی کەڵەکەکردن و بیناکردنە، هێندەش پرۆسەی دابەشبوون و وردبوونی نووسەرە. ئایا مرۆڤ لە ژیانیدا تەنها یەک وێنەی هەیە؟ تەنها یەک بیرکردنەوە و یەک تێڕوانینی هەیە بۆ ژیان؟ دەشێ من هێندەی ژمارەی تێکستەکانم بەسەر خۆمدا دابەشبووبم. وەک ئەوەی هەموو دابەشبوونێکی تر،

زیاتر لە رۆحی جیهانم نزیک بکاتەوە، کۆی دەقەکانم، لەو پارچە شوشانە دەچن، بەکۆی هەموویان وێنەیەکی من بەرجەستە دەکەن. کاتێک ویستم چیرۆکێکی خۆم هەڵبژێرم تا لەبارەیەوە بدوێم، چیرۆکی "ئەفسانەی کافکا"م بەباش زانی تا لێرەدا کەمێک لەبارەیەوە بدوێم.

دوو پرسیار لای من گرنگیی خۆیان هەیە، یەکەمیان ئەو پرسیارەیە من بۆ دەمەوێت چیرۆک بگێڕمەوە و چیرۆک بنوسم؟ پرسیاری دووەمیش ئەوەیە پێش نووسینی هەر چیرۆکێک لەخۆم دەپرسم: من بۆ دەمەوێت ئەم چیرۆکە بگێڕمەوە؟

پرسیاری یەکەمیان پەیوەندی بەقۆناغی پێش نووسینمەوە هەیە. من سەر بەو دەستەیەم لە نووسەران، بە شیعر دەستم بەنووسین نەکرد. بەڵکو من بڕیارمدا چیرۆک بنووسم. دەمویست منیش لەم ژیانەدا چیرۆکی خۆم هەبێت. منێک کە بەشدارنەبووم لە روداوە گەورەکاندا و حیکایەتی گەورەو سەرنجڕاکێشم نەبووە تا بیانگێڕمەوە، ئەگەرچی وەک زۆر کەسی تر شایەتی رووداوەکان بووم و لەگەڵیاندا ژیاوم. بەڵام دەمزانی تەنها ئارەزوو بەس نییە بۆ نووسین. پاموک لە وتاری وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵەکەیدا، دەڵێت: ئەگەر بتەوێت ببیت بەنووسەر، ئەوا دەبێت بەئارام بیت و بەتێپەڕینی کات ئەو کەسە پەنهانەی ناوت بدۆزیتەوە و گەشەی پێبدەیت، کە نووسەرەکەیە. کارلۆس لیسکانۆی ئۆرۆگواییش، کتێبێکی جوانی هەیە لەبارەی ئەو کەسەی تر، کە نووسەرە و لەناوماندایە. لەو باوەڕەدام من زوو دەرکم بەوە کردبێت ئەوەی لەناو مندایە، حیکایەتخوانە، نەوەک شاعیر، یاخود رۆژنامەنووس.

ئێستا کەدەمەوێت بیر لەو سەردەمە بکەمەوە، دەبێت بگەڕێمەوە بۆ هەشتاکانی سەدەی بیست، ئەوکاتەی من بەرەو خوێندنەوە و گۆشەگیربوون دەچووم لە هاوڕێیانی گەڕەکمو هێشتا هیچم نەنووسی بوو، چونکە من لە 1994دا یەکەم چیرۆکی خۆم بەناوی "پاشماوەی خێڵەکان"ەوە بڵاوکردەوە. نامەوێت باس لە دەیەی هەشتاکان بکەم، بەوەی سەردەمێکی چەند تۆقێنەربوو. ئێمە نەوەیەک بووین لەو دۆخە سامناکەی یەکێک لە رژێمە دیکتاتۆرە ترسناکەکان خولقاندبووی، بەکۆمەڵێک پرسیار و خەونەوە ژیاین. بۆئەوەی قسەیەکمان هەبێت، دەبێت توانای گێڕانەوەی چیرۆکەکانمان هەبێت. وەک ئەوەی گێڕانەوە، راگرتنی مرۆڤ بێت لەبەرانبەر جیهاندا.



ئەوکاتە چەند لەخۆمو دنیا رادەمام، هەستم دەکرد غەمی من، بوون بەنووسەریی نییە، ئەوەندەی ئارەزووم لەوەیە ببمە گێڕەرەوە. ئەمەش پەیوەندی بە سەرسامی منەوە هەیە بە حەکەواتییەکانی مەغربیەوە، کە لە گۆڕەپانی باب الجامع دادەنیشن و

حیکایەت بۆ ڕێبوار و بێ ئیش و گەشتیارەکان دەگێڕنەوە. تەنانەت چیرۆکێکم لەسەر ئەوانە بەناوی "لەوێ... لەبێ کۆتایی ئێوارەیەکدا" نووسی و لە کۆمەڵە چیرۆکی "فریو و خۆحەشاردان"دایە.

لەو سەردەمەدا من بەرەو ئەو بیرکردنەوەیە دەچووم، کە مرۆڤ پێویستی بە چیرۆکە: چیرۆکی خۆی، چیرۆکەکانی ژیان و ناو واقیع. دەبێت توانای گێڕانەوەمان هەبێت، تا بتوانین لەجیهان تێبگەین و راڤەی بکەین... تا مرۆڤ بدۆزینەوە. ئایا ژیان بەبێ بوونی توانای گێڕانەوە، چۆن دەبێت؟ بەڵام بۆ ئێمە دەمانەوێت چیرۆکەکانمان بۆ ئەوانی تر بگێڕینەوە؟ ئەمانە پرسیارگەلێک بوون زۆر پێیانەوە خەریک بووم‌و تەنانەت لە پێشەکیی کۆمەڵە چیرۆکی "پاشماوەی خێڵەکان 1999"دا، نووسیم: لەو باوەڕەدام ئەوەی مێژووی مرۆڤایەتی گۆڕی، گێڕانەوە بوو.

لەوانەیە کەسێک بڵێت چیرۆکنووسینیش هەربوون بەنووسەرە. ئەم پرسیارە لەدیوێکیدا راستە، بەڵام بۆ من، بوون بەنووسەر غەمی گەورەم نەبووە، هەر ئەمەش وایکرد من هەم درەنگ دەست بە بڵاوکردنەوە بکەم، هەم جگە لە بواری گێڕانەوە، ژانرێکیتر لەگەڵ خۆیدا نەمبات. تەنانەت لەو لێشاوی دەرکردنی گۆڤار و رۆژنامەیەی دنیای ئێمەی گرتەوە، من تا بۆمکرابێت دوورییەکم لەگەڵیدا پاراست. بەڵکو من خەیاڵم لای ئەوە بووە چیرۆک بگێڕمەوە. "تەنانەت لەم ساڵانەدا کە عەشقێکی زۆر هەیە بۆئەوەی وەک نووسەر و روناکبیر بەدەربکەویت، من بۆ ساتێک خۆم نەداوەتە دەست سیحری ئەم حاڵەتەش. بۆ من گرنگە یەکێک بم لە گێڕەرەوەکان و کەم




نییە ئەگەر توانای گێڕانەوەت هەبێت". بەڵام ئایا هەروا ئاسانە ببیتە گێڕەرەوەیەک لەم جیهانە فراوانەدا؟ لەم جیهانەدا کە یەکێک لەو پایانەی راگیری کردووە، گێڕانەوەیە و ئەوەی منیش لەگەڵ مرۆڤ‌و نەتەوەکانیتردا کۆدەکاتەوە، چیرۆکەکانمانە. هەربۆیە من هەمیشە بەخۆم دەڵێم لەنزیکەی حەوت ملیار کەسدا، چۆن چیرۆکی خۆت دەگێڕیتەوە؟ لەکاتێکدا تۆ ئاگات لەهەموو چیرۆکەکانی ئەوانیتر نییە و دەشێ ئەوانیش هەرگیز چیرۆکی تۆ نەبینن. ئەمە خاڵێکە هەمیشە رامدەگرێت. هەربۆیە دەبوو من لە گۆشەیەکەوە بڕوانم و هەوڵبدەم بە چیرۆکەکانی ئەوانی تر ئاشنا ببم، یاخود ئاگاداریان بم. دیارە خوێندنەوەش سەرەکیترین رێگای ئەم ئاگادار بوونەیە.

لەئاستی یەکەم بۆ ئەم ئاگاداربوونە، بەرکەوتنی یەکەممە لەگەڵ چیرۆکی کوردیدا، کە ئەوکاتە و تا ئێستاش جیاوازیی قووڵم هەیە لەگەڵ ئەو دنیایەدا. دنیایەک لە حەفتاکانەوە سەرقاڵی گرفتی "شێوەو ناوەڕۆک" بوو. بەوەی باسی تەکنیک و چۆن گێڕانەوە، کرۆکی تێڕوانینیان بوو بۆ چیرۆک. دیارە من باس لە تێڕوانینییە زاڵەکە دەکەم و حوکم لەسەر یەک بەیەکی چیرۆکەکان نادەم، بەوەی چیرۆکی جوانمان هەیە لەو سەردەمەدا. من سەر بەو

بیرکردنەوەیە بووم، دەق وەک بارستاییەک دەبینێت. بەومانایەی کاتێک من دەقێک دەخوێنمەوە، کۆی چۆنیەتی گێڕانەوە و پرسیار و دنیابینییەکانی دەخوێنمەوە. نەوەک دەق پارچە پارچە بکەم بەسەر شێوەو ناوەڕۆکدا. یاخود چیرۆکێک لەبەر فلاش باکەکەی، یاخود راناوی گێڕانەوەکەی بەلامەوە جوان بێت. من تا ئێستاش کاتێک دەقێک دەخوێنمەوە، کە لەپێناو تەکنیکدا ناتوانێت هیچمان پێبڵێت، یاخود پرسیارێک لەخۆیدا هەڵناگرێت و ناتوانێت تێڕوانینێکی ترمان پێبدات، فەرامۆشی دەکەم، چونکە دەزانم ئەو دەقە بەتەکنیک خۆی کوشتووە.

لە نەوەدەکاندا و دوای دەرکەوتنی نەوەیەکی چالاک لە دنیای نووسینماندا، دەبینین پرسیاری تەکنیک و شێوە و ناوەڕۆک تەواو پاشەکشە دەکەنو زاراوەگەلی وەک دنیابینی دەق/نووسەر، پرسیارەکانی دەق و نەوتراوەکانی دەق جێگایان دەگرنەوە. دیارە لەو قۆناغەدا بۆچوونەکانی لۆسیان گۆڵدمان و بونیادگەرەکانی دیکە، کاریگەرییەکی تەواویان دەبێت بەسەر ئەم دیدەوە. بەڵام ئەم دیاردەی تەکنیکە لەم ساڵانەی دواییدا، جارێکی تر بەدەردەکەوێتەوە. تۆ گرنگ نییە چی دەڵێی، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چۆن دەیڵێیت. ئەمەش خۆ دزینەوەیەکی گەورەیە لەو هەموو چیرۆکە سادەیەی دنیا، کە شتی جوانمان پێدەڵێن، خۆدزینەوەیە لەوەی دەق پرسیاری قوڵ و جدی لەخۆیدا هەڵبگرێت. دەشێ سەرچاوەی ئەم دیدە لای چیرۆکنووسی کورد لەحەفتاکاندا، بگێڕینەوە بۆ کاریگەریی رۆمانی نوێی فەرەنسی). من بیرم لەوە دەکردەوە ئایا بۆ تێپەڕاندنی چیرۆکنوسانی نەوەی ئیبراهیم ئەحمەدو سەجادی و... "کە چیرۆکی ناهونەرییان نووسیوە، وەک هەندێک بۆ کەمکردنەوەی بایەخیان وایان پێدەڵێن"، گرفت لەکێشەی چۆن گێڕانەوە و تەکنیکیاندایە، یاخود ئەو پرسیار و دنیابینییەی لە چیرۆکەکانیاندایە؟ ئەگەر کێشە لە تەکنیکیاندایە، ئەی چی لەو چیرۆکە سادانەی دنیا بکەین، لە ئێستادا دەنوسرێن و چیرۆکی زۆر جوانیشن؟ "لەبەر زۆریی نمونە، هەستناکەم پێویست بەنمونە هێنانەوە بکات".



من ئەوکاتە بیرم لە مەحوی دەکردەوە، مەحوی لەناو هەمان سیستمی بەلاغی و شیعریدا کاردەکات، کە زۆر لە هاوسەردەمەکانی کاریان تێداکردووە. ئەی ئەو نهێنییە چییە وا دەکات مەحوی لە زۆر کەسی تر جیاواز بێت؟ وەڵامی من تا ئێستاش دید و پرسیارەکانی مەحوییە. ئەو دیدە فراوان و قووڵەی مەحوییە، کە لەناو ئەو سیستمەدا کاری کردووە و وادەکات وەک کەسێکی تر نەنووسێت. دیارە ئەو دیدە قوڵەش ئامرازی دەربڕینی خۆی دەبێت، کە لەوانی تری جیادەکاتەوە. لەو سەردەمەدا کەسێکی وەک کازانتزاکی زۆر باش دەخوێنرایەوە. بەخۆمم دەوت ئایا هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە

بۆ ئەو راناو و فلاشباکەی بەکاری دەهێنێت؟ یاخود قوڵیی دیدگایەتی بۆ مرۆڤ؟ بۆ تا ئێستا کامۆ دەخوێنینەوە؟ "من فەرەنسی نازانم، بەڵام بیرمە وتارێکم لە نەوەدەکاندا خوێندۆتەوە، باس لەوە دەکات کامۆ لەنامۆدا جۆرێک لەزەمەنی فرمان بەکاردەهێنێت، کە ناوازەیە لەزمانی فەرەنسیدا ـئایا ئەمە تا چەند راستە، نازانم ـ. ئەگەر ئەو رایە راست بێت، ئەوا زەمەنی فەرمان لەدوای وەرگێڕان و لەزمانەکانی تردا بەهایەکی نامێنێت و دەشێ لەناو زمانە نوێکەدا ون ببێت". ئایا کافکا لەبەر کام تەکنیکەیەتی وا تا ئێستاش دەخوێنرێتەوە؟ ئایا لەبەر خاتری فلاشباک و راناوی گێڕانەوە، چیرۆک و رۆمانەکانی دەخوێنرێنەوە؟ پاشان لەهەشتاکاندا یەشار کەمال قورسایی خۆی هەبوو لای خوێنەری کورد، کاتێک لەویش رادەمام، دەمبینی یەشار کەمال لەبەر تەکنیکەکانی نییە دەخوێنرێتەوە، بەڵکو ئەو چیرۆکی هەیە بۆ گێڕانەوە. ئەمانە پرسیاری جدیی من بوون، لەوکاتەدا و هەوڵمدا خۆم لە بۆچوونی تەکنیکخوازان لابدەم.

هەر لەوکاتەدا گرفتێکی ترم دەبینی، ئەویش ئەوەبوو، چیرۆکنوسی ئێمە لەپێناو داهێنەربووندا دەنووسێت و دەکرێت ئەمە غەمێکی قورس و هۆکارێکی سەرەکی بێت لەپشت سەرقاڵبوون بەتەکنیکەوە. بەوەی هەوڵبدە تەکنیکێک بەکاربهێنیت، پێشتر کاری پێنەکرابێت و ئیدی دەتکاتە داهێنەر. بۆ من وشەی داهێنەر بۆ ساتێک فریوی نەداوم و لەگەڵ خۆیدا نەیبردووم. تەکنیک، داهێنان و فەرامۆشکردنی ئەوەی چی دەگێڕیتەوە، منی لەو فەزایە دوور دەخستەوە. بەڵام هەر لەهەشتاکاندا، ئێمە رووبەڕووی ئەزمونێکی جیاواز دەبینەوە، کە دەروازەیەک بەرووی نەوەی ئێمەدا دەکاتەوە، ئەویش ئەزمونی شێرزاد حەسەنە.




لای من گرنگی شێرزاد حەسەن لەوەدایە، سەرقاڵی ئەو گرفتانە نییە، تەکنیکخوازان پێوەی خەریکن، بەڵکو ئەو دەیەوێت چیرۆک بگێڕێتەوە. هەر سەیرکردنێکی شێرزادیش لە دیدگای تەکنیکخوازانەوە، هەڵەیەکی کوشندەیە. چونکە دەبێت لە شێرزاد حەسەندا بۆ ئەو پرسیار و دنیابینییە بگەڕێین، کە لە قووڵایی ئەزمونی ئەودا قوورساییان هەیە. بیرمە ساڵی 1987 شێرزاد حەسەن کۆڕێکی سازدا، کە تێیدا لەسەر دیدگای خۆی لەسەر چیرۆک و پێکهاتەکانی چیرۆک دوا. ئەو کۆڕەی گرنگییەکی زۆری هەبوو بۆ ئەو سەردەمە، کە توانی لە دەرەوەی دیدی باوی تەکنیکخوازانەوە، باس لەدنیای چیرۆک و بۆچوونی خۆی بکات لەسەر پاڵەوانو رووداوو...

شێرزاد حەسەن بۆ من گرنگییەکی زۆری هەبوو. من دەبوو بەدوای خاڵی جیاوازییم بگەڕێم لەگەڵ شێرزاد حەسەندا. یەکلابوونەوە لەگەڵ ئەوانیتر ئاسانتر بوو، بەوەی من باوەڕم بەبۆچوونیان نەبوو لە نووسینی چیرۆکدا "گرنگ چۆن گێڕانەوەیە"، پاشان ئەو زمانە وەسفییە وەستاوەش، کە لای ئەو نەوەیە زۆر

گرنگی پێدەدراو ئەو بابەتانەی بۆ ئەو سەردەمە جێگا بایەخ بوون. بەڵام لەگەڵ شێرزاد حەسەندا کارەکە سەختتر بوو. ئەو ئێمەی بردەوە بۆ لای پەنهانی و دیوە شاردراوەکەی مرۆڤ و پێیوتین تەنها ئایدۆلۆژیا و بەهای گەورە لەپشت دەقەوە نەوەستاون. پاشان ئەو زمانەی شێرزاد حەسەن بەکاریدەهێنا، زمانێکی پڕ جووڵەتر بوو، وەک ئەو زمانە وەسفییە وەستاوە نەبوو، ئەوانیتر کاریان پێدەکرد.

خاڵێکی گرنگ منی لە ئەزموونی شێرزاد حەسەن جیا دەکردەوە، ئەوەبوو شێرزاد حەسەن باوەڕی وابوو، دەبێت چیرۆک لەخودی نووسەرەوە دەستپێبکات. دیارە ئەمە لە ئەزمونی خۆیدا تەواو دیارە و بۆ چیرۆکی کوردییش گر نگیی خۆی هەیە. مرۆڤ بتوانێت چیرۆکەکانی خۆی و دەورووبەری بنوسێتەوە. لە رژێمێکی دیکتاتۆرییدا، مرۆڤ هیچ نییە جگە لە دەستی کار و جەنگاوەر بۆ بنیاتنانی ئەو دنیایەی رژێمەکە دەیەوێت. چاودێریی زۆر، کەوا دەکات بەردەوام لە جۆرێک خۆشاردنەوەدا بیت. خۆ دەکرێت دژ بەو دۆخەی دیکتاتۆرییەت دەیخوڵقێنێت، مرۆڤ زیاتر بگەڕێتەوە بۆ ناوەوەی خۆی. بەڵام من لەناو پەیوەندییەکاندا بۆ وێنەی مرۆڤ دەگەڕام. لەوانەیە ئەمەش پەیوەندی بەشەرمەوە هەبێت و لێگەڕام ئازاری خۆم بۆ خۆم بێت. یاخود حەزی من بێت بۆ پەنهان مانەوە و ئاشکرانەبوون لەبەردەم ئەوی تردا. لە هەشتاکاندا مرۆڤ نەیدەتوانی لەبەردەم هەموو کەسێکدا ئاشکرا بێت. هەربۆیە تا ئێستاش بەدەگمەن چیرۆکم هەیە، سیمای کەسەکانی زۆر ئاشکراو روون بن، یاخود لەبارەی دیوە تاریکەکەیەوە شت بزانرێت.



دیارە من قسە لە راستو هەڵەیی هیچ ئەزموونێک ناکەم، ئەوەندەی ئەو دۆخە دەگێڕمەوە، لەپشت تێڕوانینمەوە وەستاون، ئەگینا دەشێت هەر لەوکاتەدا، کەسێک باوەڕی وا بووبێت هەموو ئەو دۆخە پاڵنەربێت بۆئەوەی بگەڕێینەوە بۆ ناوەوەی مرۆڤ و غەم و غایەلەکانی تاک. پاشان دەبوو هەوڵیش بدەم زمانی خۆم لەگێڕانەوەدا بدۆزمەوە، نەوەک بکەومە سێبەری شێرزاد حەسەنەوە. خاڵێکی تر ئەوەبوو من تێبینیم کردبوو، نووسەری ئێمە لە چیرۆکدا زۆر لایەنگرە و من دەمویست چیرۆک وا بگێڕمەوە، کە لایەنگری رووداو یاخود پاڵەوان نەبم و هاوسۆزیم نەبێت بۆی. تەنانەت کە یەکەم چیرۆکم نووسی بەناوی "پاشماوەی خێڵەکان"ەوە، هەوڵمدا لایەنگری ئەنفالکراوەکان نەبم، ئەوەندەی چیرۆکێکی سەیریان لەبارەوە بنووسم، هێندەی سەمەرەیی روداوەکە. ئیدی دەبوو من لەنێوان زمانی وەسفیی بێ جوڵە و زیادە بەجەستەی دەقەوە و زمانی شێرزاد حەسەندا، بۆ زمانێکی تر بگەڕێم. زمانێکی چڕکراوە و پڕ رووداو.

بەڕاست من چیم لە چیرۆک دەوێت؟

ئەمە پرسیارێک بوو، کاتێکی زۆری ویست تا بتوانم وەڵامیم دەستبکەوێت. بەوەی من ئارەزوویەکی زۆرم لەوەبوو، لەو رووبەرانەدا کاربکەم، کە پڕ لە رازو پەنهانین. چیرۆک لای من دنیا ئاشکرا ناکاتو دۆخێکیش ناگێڕێتەوە. بەڵکو پڕ رازتری دەکات. وەک ئەوەی چیرۆک نووسینەوەی بەسەرهاتەکان نەبێت، بەڵکو تێکدانو بیناکردنەوەی جیهان بێت. ئەمەش زۆرجار پێویستی بەوەیە من رووداو و چیرۆکەکانی پێش خۆم بشێوێنم. ئەم شێواندنەش پەیوەندی بە ئەزموونو دیدی منەوە هەیە لە چیرۆکدا و زۆرجار لەسەر ئەم شێواندنە کارم کردووە. بەوەی چیرۆک یاخود رووداوێکی واقیعی، بشێوێنم و چیرۆکێکی تری لێدروستبکەم. ئەمەش نهێنی ئەو پەیوەست بوونەی منە بە مێژووەوە. بەوەی زۆرجار دەگەڕێمەوە بۆ ناو روداو یاخود چیرۆکێکی کۆن و هەوڵی سەرلەنوێ نووسینەوەی دەدەم، بەڵام دوای ئەوەی جارێکی تر بینای دەکەمەوە. ئەمە زۆر بەیاری میکانۆ دەچێت، بەوەی دەتوانیت لەپارچەی بچووک جارێک خانوو دروست بکەیت، جارێکی تر تێکی بدەیتەوەو مێزێکی لێ دروست بکەیت. ئەمەش لەچیرۆکی "ئەفسانەی کافکا"دا زۆر بەڕوونی دیارە. بەوەی من چۆن بتوانم لە کافکا چیرۆکێک دروستبکەم، کە گێڕانەوەی ژیانی نەبێت، بەڵکو کافکا وەک چیرۆکێک بشێوێنم و بتوانم پڕ رازتری بکەم، ئەویش لە رێگای شێواندنی چیرۆکێکی کۆنی چینییەوە. واتا من بۆ نووسینی ئەم چیرۆکە پێویستم بە شێواندنی دوو چیرۆک هەبوو، هەم چیرۆکی قەڵەمە چینییەکە، هەم چیرۆکی کافکای واقیعی، تا چیرۆکێک بگێڕمەوە.

دەمەوێت نموونەیەک بهێنمەوە، ئەگەرچی باش بیرم نەماوە چیخۆف باسی کردووە یاخود کەسێکی تر. کەسێکی قومارچی دوای ئەوەی شەوێک زۆر پارە دەباتەوە، دەگەڕێتەوە ماڵەوەو خۆی دەکوژێت. ئەمە پێچەوانەی ئەو دۆخە باو و سادەیەیە، کە قومارچییەکە لە دۆڕاندا خۆی بکوژێت. ماوەیەک کافکا ببووە پرسیار لەلامو دەمویست چیرۆکێکی لەبارەوە بنووسم. من لەو ژیانە سەیر و ناخۆشەوە دەستم پێنەکرد، کە کافکا هەیبووە. بەڵکو بەخۆمم وت ئایا کافکا هەبووە؟ ئیدی بەدوای ئەو ئاماژانەدا گەڕام، کە گومان لە بوونی درووستدەکات. تا گەشتمە ئەوەی وای بۆ بچم کافکا درووستکراوی ماکس برۆدی هاوڕێی بێت. من لێرەدا توانیم حەقیقەتی کافکا بشێوێنم، بەوەی بوونێکی واقیعی نییە و ماکس برۆد خوڵقاندوویەتی. بێئەوەی لەوە تێگەشتبێت، ئەو ئەفسانەیەی دەیخوڵقێنێت، بەسەر وێنەی خۆیدا زاڵدەبێت. لێرەدا کەوتمە بەردەم ئەو کێشەیەی چۆن وێنەکان زیاتر لە ئەسڵەکان دەژین، بەهەمان شێوە ئەفسانەکانیش لە خوڵقێنەرەکانیان زیاتر دەژین. بۆ تەواوکردنی ئەم پرۆسەی شێواندنە، بیرم لە چیرۆکی قەڵەمە سیحرییەکە کردەوە تا بتوانم باشتر بەو یارییە هەستم و چیرۆکێکی تریش



بشێوێنم.

لێرەدا پرسیارێک گرنگە: ئایا لە ئەفسانەی کافکادا، من دەمەوێت کام چیرۆک بگێڕمەوە؟ چیرۆکە چینییەکە، یاخود بەسەرهاتی ماکس برۆد، بەوەی چۆن ئەفسانەیەک دەخولقێنێت و بەسەر وێنەی خۆیدا زاڵ دەبێت، یاخود دەمویست چیرۆکی کافکا بگێڕمەوە؟ گرنگی پرسیارێکی وا، لەوەدایە پەیوەندی بە دەقەکانی تریشمەوە هەیە و من هەمیشە لە چیرۆکێکدا، لە زیاد لە چیرۆکێک کاردەکەم. بەوەی من ئەگەر چیرۆکێکم هەبێت بۆ گێڕانەوە، ئەوا لەپاڵیدا چیرۆکی ترم هەیە لەگەڵیدا دەڕۆن. تەنانەت زۆرجار من مەبەستم لە گێڕانەوەی چیرۆکە سەرەکییەکە نییە، بەڵکو دەمەوێت چیرۆکە پەراوێزەکە بگێڕمەوە.



ئەوەی من لەم چیرۆکەدا ویستم پێیهەستم، ئەوەبوو ئەو کافکا نائاساییەی لەئێستادا بۆتە شتێکی مەئلوف و ئاسایی لامان، جارێکیتر نامەئلوف بکەمەوە. ئەمە ئەو خاڵەبوو دەمویست پێیبگەم: چیرۆک بۆ بە نامەئلوفکردنی شتەکانە. بەخشینی بینینێکی ترە پێمان. پاشان من ویستم لە ڕێگای چیرۆکی کافکاوە، باس لە پەیوەندی ژیانی ئەفسانەکان بە خولقێنەرانیانەوە بکەم.

لەبەرکەوتنی دووەممدا بۆ چیرۆک، دەگەڕێمەوە بۆ دەیەی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو. وەک ئەوەی ڕەگی من لەوێدا بێت و ئارەزووم لەوەبێت باس لەو چیرۆکانە بکەم، لەوکاتەدا تووشی سەرسامییان کردووم و کاریگەرییان هەبووە بەسەر تێڕوانینی من بۆ چیرۆکو دنیابینیمەوە.

دیارە زیاد لە چیرۆکێک هەبووە، بەقوڵی کاریگەرییان لەسەر من بەجێهێشتووەو بەرەو ئەو بیرکردنەوەیە پەلکێشیان کردووم، گرنگی چۆن بینینی دنیام بۆ دەربکەوێت. بەتایبەت بۆ من کە تا ئێستاش لەو باوەڕەدام، یەکێک لەو پایانەی دەقی گێڕانەوەی لەسەر دەوەستێت، سەرسامکردنە. دەتوانم بڵێم من تا دەهات ئەو چیرۆکانە پەلکێشیان دەکردم، کە دەیانتوانی گۆشەنیگایەکی ترم نیشان بدەن تا لێیەوە سەیری شتەکان بکەم. وەک گۆنتەر گراس لە چیرۆکی "ژێرزەمینی پیاز"دا دەیکات، کە دوور لە هەموو خۆ سەخڵەتکردنێک لەپێناو تەکنیکدا، دەمانباتە چێشتخانەیەکی سەیر و تایبەتەوە، تیایدا لەجیاتی خواردن، سەلکەپیازێکو چەقۆیەک دەبرێتە بەردەم موشتەرییەکان، تا بەدەم گێڕانەوەی بیرەوەری، یادکردنەوە و جنینی پیازەکەوە، فرمێسک لەچاویان بێت و بگرین. وەک

ئەوەی مرۆڤەکان توانای گریانییان نەمابێت.

چیرۆکی جوان زۆرە، کە هەریەکەیان لە شوێنێکەوە کاریگەرییان دەبێت لەسەرمان. بەڵام من زیاتر ئەو چیرۆکانە لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردم، دوور لەغەمی داهێنانو کردنی کارێک پێشتر نەکرابێت، جیهانو روداو و شتەکانی بەجۆرێکی تر نیشان دەدام. بیرمە ئەوکاتە چیرۆکێکی عەبدولستار ناسرم بەناوی "چایخانەی حەسەن عەجەمی" خوێندەوە، زۆر جوان بوو بەلامەوە. چیرۆکەکە باس لەپیاوێک دەکات هەڵهاتووەو خۆی ونکردووە. رۆژانە سەردانی ئەو چایخانەیە دەکات "دیارە ئەو چایخانەیە بەراستی لە بەغدا هەیەو بەناوبانگە، بەوەی بەشێک لەنووسەر و رۆشنبیرانی لێدادەنیشن"، بۆئەوەی خەڵکەکە زۆر سەرنجی نەدەن و پرسیاری لێنەکەنو ئاشکرا نەبێت، بیر لەوە دەکاتەوە سەرقاڵیان بکات. ئەوە دەبێت یارییەک دادەهێنێت بەناوی دۆمینەوە.

لەو ساڵانەدا من بەسەر ئەدەبی ئەمریکای لاتینیدا دەکرێمەوەو ئیدی جیهانێکی سەیر کەشف دەکەم، کەوا دەکات لەو رێگایەوە بگەڕێمەوە سەر ئەدەبی گێڕانەوەی ئیسلامی و سیحری گێڕانەوە لەم کلتورەدا بدۆزمەوەو سەیر و سەمەرەیی حیکایەت لەگەڵ خۆیدا بمبات، "ئەمەش سەفەرێکی ترە بە دنیای گێڕانەوەداو لێرەدا وازی لێدەهێنم".

من لێرەدا بە مەبەست دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ سەر چیرۆکێک، کە لە تەمەنێکی زوودا کاریگەرییەکی قوڵی لەسەرم جێهێشت و زەمەن نەیتوانیوە زەفەری پێبەرێت و لەبیرم بەرێتەوە. بیرمە لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا بوو کۆمەڵە چیرۆکی "تحت سماء الجلید"ی جاک لەندەنم خوێندەوەو لەناویدا چیرۆکێک زۆر سەرنجی ڕاکێشام، ئەویش چیرۆکی "دەربازبوونێکی سامناک" بوو، کە وەرگێڕەکەی ناونیشانەکەی بەو شێوەیە گۆڕی بوو.




ئەم چیرۆکە باسی بەسەرهاتو چارەنووسی سۆبییێنکۆڤ دەکات، کە چۆن ژیان و رووداوەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن و لە کەسێکی ناسک و پڕ لە خەونەوە، دەبێتە بکوژ و دز لە ناوچەی دوورو سارددا، تا سەرئەنجام لەلایەن ئەو خێڵەوە دەستگیر دەکرێت، کە چەند رۆژێک پێش ئەوە بە سەختی جەنگاوە لەگەڵیاندا. دوای دەستگیرکردنیشی دەبینێت ئەو خێڵە چ ئەشکەنجەیەکی سامناکی هاورێکانی دەدەن تا دەیانکوژن. سۆبییێنکۆڤ دەترسێت ئەشکەنجە زەلیلی بکات، بەوەی تووشی گریان و پاڕانەوەی بکات، هەرچەندە دەشزانێت پاڕانەوە هیچ سوودێکی نییە. لەبەرئەوە فێڵێک لە سەرۆک خێڵەکە دەکات و ئابرووی دەبات لەناو خێڵەکەیدا. فێڵەکەشی ئەوەیە پێیدەڵێت ئەم توانای هەیە دەرمانێک دروستبکات، ئەگەر لەشی پێ چەور کرا، ئەوا شمشێر و چەقۆ توانای برینییان نابێت. خۆ ئەگەر ژیانی پێبداتەوە، ئەوا نهێنی ئەو دەرمانەی پێدەڵێت. سەرئەنجام سەرۆک

خێڵەکە رازی دەبێتو سۆبیێنکۆڤ لە گژوگیا گیراوەیەک دروست دەکات و لەسەر خۆی تاقیدەکاتەوە، بەوەی ملی پێ چەوردەکات و داوا دەکات بە شمشێر لە ملی بدەن. کاتێکیش لە ملی دەدەن، سەری دەپەڕێت و بزەیەک لەسەر لێویەتی. ئەوکاتە سەرەک خێڵ دەزانێت سۆبیێنکۆڤ چ فێڵێکی لێکردووە و هەڵیخەڵەتاندووە و لەناو خێڵەکەدا ئابڕووی بردووە.

ئەو چیرۆکە لە چەند لایەنێکەوە کاریگەری لەسەرم جێهێشت: من سەرسامی ئەو زمانە پڕ لە جوڵەیەی بووم، بەدرێژایی چیرۆکەکە ئامادەیی هەیە و توانیویەتی بارودۆخی مرۆڤەکان، دڵڕەقی و سەرما بگوازێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا من لەو تەمەنەدا گرفتم لەگەڵ ئەو زمانە وەسفییە زاڵەی چیرۆکی کوردیدا هەبوو. ئەم چیرۆکە دەروازەیەک بوو بۆ من تا جۆرێک بەکارهێنانی تری زمان ببینم لە چیرۆکدا، لەو رووبەرە بچوکەی گێڕانەوەدا، کە هەر وشەو رستەیەک پێگەی خۆی هەیە لە تێکستدا. پاشان گرنگیدان بەو دۆخەی مرۆڤی تێدایە و سەیرکردنی مرۆڤ لە پەیوەندی بە ئەوانیتر و دەورووبەرییەوە. واتا بینینی مرۆڤ لەناو رووداوەکاندا.



لەو چیرۆکەدا توانیم پەیوەندی نێوان گێڕانەوە و سەرسامکردن بدۆزمەوە. بەوەی چۆن جاک لەندەن لەرێگای فێڵێکەوە تووشی سەرسامیمان دەکات، کاتێک دەزانین سۆبیێنکۆڤ دەیەوێت خۆی دەربازبکات، ئەویش لەرێگای فێڵێکەوە. ئەم فێڵەش بۆئەوەیە تا زوو بگاتە مردن و ئەو ئەشکەنجەیە نەبینێت، کە هاوڕێکانی بینیویانە. نهێنی و جوانی ئەم چیرۆکەش لەو فێڵەدایە. جاک لەندەن نایەت باس لە سامناکی و قێزەونیی مردنمان بۆ بکات، بەڵکو لەو دۆخەی سۆبیێنکۆڤ دا، مردن فریادڕەسە لەدەست دڵڕەقییەکی سامناک و هەموو هەوڵیشی ئەوەیە زوو بگاتە مردن، بێئەوەی ئەشکەنجەی سامناک و تۆقێنەر ببینێت. بەمانایەکی تر سۆبیێنکۆڤ رێگایەک دەدۆزێتەوە بۆ هەڵهاتن لە دڵڕەقی، ئەویش رێگایەکی سامناکە تا زەلیل نەبێت. ئەو فێڵەی جاک لەندەن لەگەڵماندا دەیکات ئەوەیە، دەمانباتە دۆخێک، چاوەڕوانمان نەکردووە و لە خەیاڵی ئێمەدا نەبووە.

ئەم چیرۆکە ئەوەی پێوتم، جوانی چیرۆکەکان لەو ساتانەدا چڕ دەبنەوە، هەموو یارییەکە هەڵدەگێڕینەوە و شتێک بە خوێنەر دەڵێین، لەدەرەوەی رێڕەویی رووداوەکانە و دوور لەوەیە خوێنەر مەزەنەی دەکات.



پێشتر ئەم چیرۆکە کراوە بەکوردی، بەڵام لەبەرئەوەی شوێنی بڵاوبوونەوە و ناوی وەرگێڕەکەم بیرنەمابوو، نەمتوانی پەیدای بکەم.



# ئەفسانەی کافکا

عەتا موحەمەد

حیکایەتێکی چینی ناسراو هەیە، کە بەعەرەبی خوێندومەتەوە، ئەگەرچی ناوی وەرگێڕی عەرەبییەکەیم بیرچۆتەوە، باس لە قەڵەمێکی سیحری دەکات، کە هەر وێنەیەکی پێبکێشرایە، دەبوو بەراستیو کاغەزەکەی بەجێدەهێشتو دەچووە ژیانەوە. هەرچەندە من نازانم چەند باڵندەو ئاژەڵو وەچەی مرۆڤ، ئێستا لە ژیاندانو بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر یەکێك وێنەکانی ئەو قەڵەمە سیحرییە، هەرچۆن حیکایەتەکە باس لە قەبارەی وێنە زیندوکراوەکانیش ناکاتو پێماننالێت بۆ دروستکردنی ئاسمانێکی

لە



تر، یاخود زەوییەکی تر، تەنانەت پەڵە هەورێکو بوونەوەرێك، تەنها ئەوەندە بەس بووە کە وێنەیەکی بکێشین لەسەر پارچە کاغەزێك، یاخود دەبێت هێندەی وێنە ئەسڵییەکە بێت. پاشان چۆن وێنەی ئەو شتانە بکێشینەوە، کە وێنەیان نییەو تەنها دەتوانین وێنایان بکەین، وەك خواو یادەوەریو رقو خۆشەویستیو زۆر شتی تر. بەهەرحاڵ باسکردنی ئەو قەڵەمە سیحرییە، لەبەر ئەو خەیاڵە فراوانە نییە کە لەپشت چیرۆکەکەیەوە وەستاوە، چونکە هەموومان رۆژێك خەونمان بە قەڵەمێکی واوە بینیوە، یاخود خەیاڵێکی وامان هەبووە کە بتوانین زۆر باڵندەی سەیر بخولقێنین، یاخود هەندێك رێگای پێ دروستبکەین کە بمانباتەوە سەر ئەو شارو بازاڕە سەیرو نەزانراوانەی خەون بە کوچەو حەوزو روبارەکانیانەوە دەبینین. بەڵکو باسکردنی ئەو قەڵەمە سیحرییە، بۆئەوەیە تا جیاواز لەزۆری تر بڵێم، کە ئەو حیکایەتە، بەسەرهاتی قەڵەمێك دەگێڕێتەوە کە حەقیقی بووەو بوونی هەبووە، نەوەك ئەندێشەکراو بووبێت، رۆژانێك لە دەستی وێنەکێشێکی چینیدا بووە، کە سەرئەنجام لەترساندا قەڵەمەکە وندەکات، چونکە ئەو شتانەی لە نووکی ئەو قەڵەمەوە دەنەخشێنران و دەبوونە راستی، زۆر لە وێنە راستەقینەکان سامناکترو جوانتربوونو



ئەو وێنەکێشە، هەرگیز شمشێرێکی نەدیبوو وەك شمشێرە بەرجەستەبووەکان لە نوکی ئەو قەڵەمەوە، تیژو پڕ نەخش و سامناك بووبنو سوپایەکیشی بەو بێشومارییە نەدیبوو وەك سوپای چینییەکان، کە قەڵەمەکە دروستی کردبوون، هەرچۆن ئافرەتەکانیش وابوون. دوای ئەوەی وێنەکێشە چینییەکە لەکێشانی وێنەی پاسەوانە بێشومارەکانی چینو شورا سەرسوڕهێنەرەکەی دەبێتەوە، قەڵەمە سیحرییەکە دەیترسێنێت، بەوەی دڵنیادەبێت کە ئەو قەڵەمە دەتوانێت یاساو رژێمی شتەکانیشی پێ تێکبدرێت، بەڵام نایەوێت بەیەکجاری قەڵەمەکە بفەوتێنێت، وەك ئەوەی بزانێت کە لەداهاتوودا من ئەم چیرۆکە لەبارەیەوە دەنووسم، بەڵکو قەڵەمەکە ون دەکات و پاش ساڵانێکی زۆر، لەوانەیە چەندین سەدەش بێت، بە رێگای سەیرو نادیاردا، دەگاتە دەست کوڕێکی گەنجی چیکی، کە خولیای رۆماننووسینی

هەیە.
زۆرجار وا بیردەکەمەوە ئەگەر ئەو قەڵەمە بکەوتایەتە دەست من، ئەوا دوو کارم پێدەکرد کە یەکەمیان دروستکردنەوەی دەوڵەتی ماد دەبوو بەهەموو وردەکارییەکییەوە، ئەویش نەك لەبەر گێڕانەوەی شکۆیەکی لەدەستچوو، بەڵکو تا خۆم دەوڵەتی (ماد)ێکی راستەقینەی جیاواز لە هی کتێبە مێژووییەکان بخوڵقێنم. دووهەمیشیان رێگایەکم پێ دروستدەکرد کە هەرگیز تەواونەبێت، تا تێربوومایە لە تامی سەفەر. ئەو رێگایە بە شوێنی هێندە سەرسوڕهێندا بڕۆشتایە، کە دووبارە بوونەوەی تیا نەبوایە.
ئەگەرچی دڵنیانەبووم لەوەی کە ئایا ئەو دەوڵەتە فراوانەی ماد، چۆن جارێکیتر لەسەر ئەم زەوییەی ئێستامان جێیدەبووەوە، یاخود بۆ جێکردنەوەی سەرزەمینی مادەکان لەنەخشەو سەرزەمینی ئێستادا، دەبوو سەرلەنوێ جیهان بنەخشێنمەوە و ئەو رێگا بێکۆتاییەشی پێدابڕوات، کە هەمیشە لە ئەندێشەمدایە. دڵنیانەبووم.. بەڵام پێدەچێت بۆ بەرجەستەکردنی ئەو ئەندێشانەم، دەبێ چەندین جیهانی تر بنەخشێنم.
بەڵام خەونی من وەك ئەوەی گەنجە چیکییەکە نەهاتەدی، کە بە ماکس برۆد ناسراوە. ماکس برۆد،



کە دواتر بە هاورێکەی کافکا دەناسرێت، لە رێگای ئەو قەڵەمە سیحرییەوە، یەکێك لە سەیرترین ئەفسانەکانی سەدەی بیست دروستدەکات، کە دواتر بە «ئەفسانەی کافکا» دەناسرێت.
ئەفسانەی ئەو نووسەرە پڕگومان و رەشبین و دۆزەخییەی، کۆتایی رۆمانەکانی دەمانترسێنێ.
بەپێی ئەفسانەکەی ماکس برۆد، کافکای جولەکەی چیکیی، زمان ئەڵمانیی، لە سێی تەمووزی ١٨٨٣ لەدایك بووەو لەهەمان رۆژی ساڵی ١٩٢٤دا، واتا لە سێی تەمووزی ١٩٢٤دا، بەنەخۆشی سیل مردووە. دەشێ هەڵبژاردنی یەك بەروار بۆ لەدایك بوون و مردنی کافکا، کە لەوانەیە تەنها کافکا بەروارێکی وای هەبووبێت، بەلای ماکس برۆدیشەوە جێگای سەرسامی بووبێتو نەیزانیبێت بۆچی یەك رۆژی هەڵبژاردووە بۆ لەدایك بوون و مردنەکەی.
بەهەرحاڵ نامەوێت بەوردی ژیانی کافکا بنووسمەوە و لەبارەی نەخۆشی سەرئێشەو بێخەویو گۆشەگیریو تەنیاییە سامناکەکەیەوە بدوێم، کە لەزۆر کتێبدا نووسراونەتەوە. تەنانەت باس لەو سێ ئافرەتەش ناکەم کە لە ئەفسانەکەی کافکادا هەیەو

هەریەکێکیان لەپشت کتێبێکییەوە وەستاوە. هەروەها ناگەڕێمەوە سەر ئەو نامەیەشی کە بۆ باوکی دەنووسێت و هەرگیز ناگاتە دەست باوکی، چونکە ماکس برۆد زۆر بەوردی چیرۆکی ئەو ژیانە پڕ لە ئازارەی نووسیوەتەوە و وادەکات کافکا زوو بمرێت و وەسێتەکەشی نەیەتەدی، کە سوتاندنی دەستنوسەکانییەتی، تا ماکس برۆد چیرۆکەکەی تەواوبکات.

بەپێی گێڕانەوەکەی ماکس برۆد، کافکایەك هەیە، کە بە دڵڕەقیو گۆشەگیرییە سەختەکەی، یەکێکە لە کەسایەتییە سەرسامکەرەکان، کە پێدەچێت تاریکترین کەسایەتی بێت، تا ئێستا ناسیبێتمان، کە هەرگیز گۆشەیەك نادۆزێتەوە بۆ ئارامی. دەبێت کافکای پاڵەوانی چیرۆکەکەی ماکس برۆد، بەو عەزابەوە تا مردن بژی و کتێبە سەیرەکانی بنووسێت، کە تەنها کتێبن ئینسان هەست بە نسرمی دەکات لەکاتی خوێندنەوەیاندا، دیارە مەبەستم لە (ساردێتی) نییە، بەڵکو مەبەستم لەوەیە کە لەکاتی خوێندنەوەی کتێبەکانیدا، هەستبکەیت بە ڕاڕەوێکی تاریكو شێدارردا رێدەکەیت، کە هەرگیز تەواو نەبێت. بەمانایەکی تر دەمەوێت بڵێم کە ماکس برۆد هەوڵینەدا مرۆڤێك بەو قەڵەمە سیحرییە بخوڵقێنێت و ببێتە بەرجەستەکەری ئازار، ئەوەندەی ویستی ڕاڕەوێکی زیندو بخوڵقێنێت، ڕاڕەوێکی لول پێچو بێکۆتا، کە ئەویش کافکا بوو.

وەك لە چیرۆکەکەی ماکس برۆددا هاتووە، کافکا زوو دەمرێت و چەندین دەستنووس بەجێدەهێڵێت، کە دواتر ماکس برۆد خۆی تەواویاندەکات و بەناوی کافکاوە بڵاویان دەکاتەوە. دیارە پێچەوانەی زۆر چیرۆكو بەسەرهاتی تر، چیرۆکەکەی ماکس برۆد سێ خاڵی لاواز لەخۆ دەگرێت، کە ڕاستی ئەو بۆچوونە بەدەردەخات، پێیوایە کافکا هیچ نەبووە جگە لە چیرۆکێکی ماکس برۆد و ئەم چیرۆکەش هەوڵی ئاشکراکردنی، نەبوونی کافکایەکی ڕاستەقینە دەدات.

یەکێك لەو خاڵە لاوازانەی لە چیرۆکەکەی ماکس برۆددایە، نەگەشتنی نامەکەی کافکایە بەدەستی باوکی، کە دیارە ئەگەر کافکایەك هەبووبێت لە دەرەوەی چیرۆکەکەی ماکس برۆد، ئەوا زیاد لە ڕێگایەکی لەبەردەمدا دەبوو بۆ گەیاندنی ئەو نامەیە، هەرچۆن نەسوتاندنی دەستنووسەکانی لەلایەن خۆیەوەو داواکردنی لە ماکس برۆد، کە دوای مردنی بەو کارە هەستێت، دووەمین خاڵە بۆ سەلماندنی نەبوونی کافکا، کە ئەگەر هەبووبێت، ئەوا دەیتوانی وەك گۆگۆل



چۆن چەند رۆژێك پێش مردنی، لە ١٢ی شوباتی ١٨٥٢ هەڵدەستێت بە سوتاندنی بەشی دووهەمی رۆمانی (گیانە مردووەکان)، پاش ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ دونیای رۆحانییەت و نوێژو رۆژوگرتن، کە دوای گەڕانەوە بێئومێدانەکەی لە فەلەستین، بە هەستکردنێکی قوڵ بە غوربەت و ئازارو گۆشەگیرییەوە، پەنادەباتە بەر راهیبێك لە مۆسکۆ. ئەویش باسی تەماحە پیس و بەدەکانی ئەدەبی بۆ دەکاتو بۆی روون دەکاتەوە کە خەونی ناوبانگ و نەمری، خەونێکی پڕوپووچ و بێ بەهایە. ئیتر گۆگۆڵ رووەدەکاتە ئیمانێکی سۆفیانەو دەستنووسی رۆمانەکەی دەسوتێنێت.
بەڵام کافکا دەستنوسەکانی نەسوتاند.
پاشان لە دەستنووسی رۆمانی «قەڵا»دا، کافکا وادەکات کە پاڵەوانی رۆمانەکەی رێگای چوونە ژورەوەی قەڵاکە بدۆزێتەوە، کەچی لە نوسخە بڵاوکراوەکەدا، هەرگیز رێگای چونە ژورەوەی قەڵاکە نادۆزێتەوە، کە دیارە دوا نوسخەی رۆمانەکە، ماکس برۆد نووسیویەتییەوە و پاکنووسی کردووە، نەوەك کافکای چیرۆکەکەی.
ئەگەرچی ماکس برۆد ویستی لە کافکادا، وێنەیەکی ئەفسانەیی ئازار بەرجەستە بکات و لەرێگای ئەویشەوە چیرۆکەکانی خۆی بنووسێتەوە، بەڵام نەیدەزانی ئەو وێنەیەی کافکا، کە قەڵەمە سیحرییەکەی خۆی دەیکێشێت، بەسەر وێنەی خۆیدا زاڵدەبێت و خۆی تووشی فەرامۆشی دەکات، وەك ئەوەی وێنەکان حەقیقەت بن، نەوەك مرۆڤ.
پێدەچێت ئێستا لە نهێنی نەفەوتاندنی ئەو قەڵەمە تێبگەم بۆ هەتا هەتایە، لەلایەن کابرا چینیەکەوە، بەوەی ویستی نەمری، لە وێنەدا بەرجەستە بکات.

ئەم چیرۆکە لە رۆژنامەی هاوڵاتی ژمارە ٤١٧ رۆژی ٢٠٠٨/٤/٢٧ بڵاوبۆتەوەو دەکەوێتە بەشی سێیەمی سێینەی «تینا و چیرۆکە ئەندێشەکراوەکان ـ وێنەو دەمامك»، کە هێشتا بڵاوم نەکردۆتەوە.



# ئابڕوچوون

## جاك لەندەن



### وەرگێڕانی: عەبدوڵا قادر دانساز

ئەمە کۆتاییەکە بوو. سۆبییێنکۆڤ ڕێگایەکی دوورو ناخۆشیو ترسی بڕیبوو، وەکو کۆترێکی نامەبەر، پایتەختەکانی ئەوروپای بردو لێرە، لەوپەڕی دنیا، لە سەفەرەکەی کۆتایی پێ هات. لەنێو بەفرەکە بە بەستراوەوە دانیشتبووو چاوەڕوانی ئەشکەنجەی بە فزوولەوە زەق زەق تەماشای ئەو کۆزاخییە دەکرد، کە بەدەم ئازارەوە دەیناڵاند و بەدەما لەنێو

درێژی پڕ لە ئامانجێك بەرەو ڕوسیای ئەمەریکی، دەستی لەپشتەوە دەکرد. زەبەلاحەی بەفرەکەدا

کەوتبوو. پیاوەکان لە ئەشکەنجەدانی ئەو دێوە ببوونەوە و بە ژنەکانیان سپاردبوو. گریانی ئەو زەبەلاحەش، شایەتیی ئەوەی دەدا، دڕندەیی ژنەکان لەوەی پیاوەکان کەمتر نییە.

سۆبیێنکۆڤ تەماشای دەکردو لەرزی لێ هاتبوو. ئەو لە مردن نەدەترسا، ماوەیەکی زۆر درێژ، ژیانی خۆی بەنێو ئەو ڕێگا سەختەی نێوان وارشۆ و نولاتۆ بەکێش کردووەو ناشێ تەنها لەبەر مردن لەرزی لێ بێت. بەڵکو ئەو دژی ئەشکەنجە بوو. ئەشکەنجە سوکایەتی بە ڕوحی دەکرد، ئەم سوکایەتی کردنەش نەدەگەڕایەوە بۆ ئەو ئازارەی دەبوو بەرگەی بگرێت، بەڵکو پەیوەندی بەو دیمەنە پڕ شەرمەزارییەوە هەیە، کە تێیدەکەوێت. دەیزانی، دوای ئەوەی ئەشکەنجەدانی ئیڤانە زلە و کوشتنی ئەوانی دیکەیشی بینی، تووشی پاڕانەوە دەبێت و داوای بەزەیی دەکات. بەڵام پاڕانەوە هیچ سوودی نابێت. شکۆ ئەوەیە وەك جەنگاوەرێك ئازایانە بمرێت و زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕییانە بەرانبەر مردن لەسەر لێوی بێت. ئای... ئەوە شێوازێکی نموونەییە بۆ مردن. بەڵام ئەگەر کۆنترۆڵ لەدەست بداتو ڕێگا بدات ئازاری جەستە زەفەر بە ڕوحی پڕ شکۆی بەرێت و وەکو مەیمونێك هاوار بکات و چەنەچەن بکات، ڕێگا بدات ئازار بیکات بە گیاندارێکی بێ فەڕ، ئەوا ئەمە ترسناکترین شت بوو لێی بترسێت. هیچ بوارێك نەبوو بۆ




هەڵهاتن. هەر لەسەرەتاوە، لەوکاتەوەی خەونی ئاگرینی بە ئازادی پۆڵەنداوە دەبینی، بەدەستی چارەنووسەوە بووبوو بە بووکەڵە. هەر لەسەرەتاوە، لە وارشۆ، لە سانت پێتەرسبۆرگ، لە کانەکانی سیبیریا، لە کامچاتکا، لە پاپۆڕە شێتەکانی فەروودزەکاندا، چارەنووس ئەمی بەرەو لای ئەم کۆتاییە هێنابوو. هیچ گومانی تیادا نییە، چارەنوس پیتەکانی ئەم کۆتاییەی لە بناغەی دونیادا هەڵکۆڵیوە. ئەوێك نازدارو دڵناسك و موونەرم، ئەوێك کە خەیاڵپلاو، شاعیرو هونەرمەند بوو. هەر لەسەرەتاوە، پێش ئەوەی لەدایك بێت، بڕیاری ئەوە درابوو، کە ئەو قوڕە لەرزۆکەی بوونی ئەمی لێ پێکهاتووە، دەبێت لە باوەشی دڕندایەتییەکی پەتی و گیانەوەری دڕندەدا بژێت و لەم وڵاتە تاریكو دووردەستەدا بمرێت. لەم جێگا تاریکەدا، کە دەکەوێتە پشت هەموو سنوورەکانی جیهانەوە.

سۆبیێنکۆڤ ئاهی هەڵکێشا. ئەو شتەی لەبەردەمی ئەودایە ئیڤانە زلەیە ـ ئیڤانە زلە، دێوەکە، ئەو پیاوەی دەماری نییە، پیاوە ئاسنینەکە، ئەو کۆزاخەی بوو بە

چەتەی دەریا، ئەو پیاوەی وەکو گایەك بێهەست بوو، کەسێکی بێ دەماغ بوو، بەوەی ئەوەی ئازاری بە پیاوانی ئاسایی دەبەخشی، بۆ ئەم ختوکەیەکیش نەبوو. سوبیێنکۆڤ بە عەقڵییەوە ناچێت مرۆڤێك ئەوەندە ئازاری چەشتبێت و لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بژێت. ئیڤانە زلە باجی بێ دەماغییەکەی خۆیدا. توانای بەرگەگرتنی ئیڤان بۆ ئەشکەنجە، هێندەی توانای دوو پیاو دەبوو. سۆبیێنکۆڤ هەستی کرد، لەوە زیاتر توانای بەرگەگرتنی ئەشکەنجەی کۆزاخەکەی بەبەرەوە نەماوە. بۆچی ئیڤان نەمرد؟ ئەگەر بێتو ئەو قیژە و هاوارە کۆتایی پێنەیەت، ئەوا ئەم شێت دەبێت. بەڵام هەر کە کۆتایی پێهات، ئیتر نۆبەی ئەم دێت. ئالەوێ یاکاگا وەستابووو بەدەم چاودێریکردنەوە بزەی دەهات. یاکاگایەك، کە زۆر دەمێك نابێت، هەر هەفتەی ڕابردو بوو، سوبیێنکۆڤ ئەوی لە قەڵا بەدەرنابووو بە قامچی سەگەکان شریقەی لەسەر دەموچاوی هەڵساندبوو. یاکاگا بەخۆی سەرپەرشتی ئەم دەبێت. بەدڵنیاییەوە باشترین ئەشکەنجەکانی بۆ سۆبیێنکۆڤ هێشتووەتەوە، ئەوانەی خەیاڵ پەی پێنابات‌و زۆر بە نایابی دەمارەکان وێران دەکەن. ئای! دەشێ ئەوەی ئیڤان دەیچێژێت، زۆر سامناك بێت، ئەمەشی لە هاوارەکانی ئیڤانەوە دەرك کرد. ژنە هیندییە سوورەکان، کە وەستابوون‌و خۆیان بەسەریدا چەماندبووەوە، بەرەو دوا کشانەوەو دایان لە قاقای پێکەنین‌و دەستیان بە چەپڵەلێدان کرد. سۆبیێنکۆڤ ئەو ئەشکەنجە دڕندانەیەی ئەوانی بینی، کە دەرحەق بە ئیڤان ئەنجامیاندا و دەستی بە پێکەنینێکی شێتانە کرد. هیندییە سوورەکان دیقەتی ئەمیان دەدا، چونکە پێدەکەنی. بەڵام سۆبیێنکۆڤ لەتوانایدا نەبوو پێکەنینەکەی خۆی ڕابگرێت. نەیتوانی ئەو کارە بکات. دووبارە دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا شکا. گرژبوونی خۆنەویستانەی ماسولکەکانیشی، وردە وردە نەدەمان. هەوڵیدەدا بیر لە شتی تر بکاتەوە، دەستی کرد بە بیرکردنەوە لە ڕابردووی ژیانی خۆی. دایك و باوك‌و ئەسپە کورتەباڵا بەڵەکەکە و مامۆستا فەرەنسییەکەی هاتەوە بیر، ئەوەی فێری سەمای کردبوو بەدەستی خۆشی بەندێکی داڕزاوی کۆنی کتێبەکانی ڤۆڵتێری بەدزییەوە بۆ ئەم هێنابوو. هەمدیسان پاریس، لەندەنی خەمناك، ڤییەنای شادمان‌و ڕۆمای بینییەوە. هەمدیسان ئەو گروپە گەنجە یاخییەی بینییەوەو ئەو خەونە شێتانەیەیانی بیر هاتەوە، کە خەونی ئەمیش بوو، خەون



به پۆڵەندایەکی ئازاد و بە پاشایەکی پۆڵەندییەوە، کە لە وارشۆ لەسەر تەختی پاشایەتی دابنیشێت. ئای... ئالەوێوە سەرەتاکە دەسپێدەکات، سەرەتای ئەم ڕێگا دوورو درێژە. ئێ باشە، ئەوان هەموو تیاچوون و جگە لەم، کەسی تریان نەمایەوە. یەك لەدوای یەك تیاچوون. سەرەتا دوانیان لە سان پێتەرسبۆرگ بەدارا کران، ئیدی یەك یەك دەستی بە ژماردنی ئەو ڕوحە قارەمانانە کرد، کە لەنێوچووبوون: یەکێکیان لەلایەن پاسەوانی بەندیخانەکەوە ئەوەندەی لێدرا، تا مرد. یەکێکی تریشیان لە ریگا مرد، لەسەر ڕێگای تاراوگەی سوور بەخوێن، ئەو ڕێگایەی لەژێر چاودێریی پاسەوانە کۆزاخییەکاندا، کە تاڵاوی ئەشکەنجەیان دەکرد بە قورگیاندا، ناچارکران ماوەی چەندین مانگ بەسەریدا بێنو برۆن. یەکێکی تریان لە قەراغی ڕێگاکەدا کوژرا. هەمیشە درندایەتییەکی زۆر، درندایەتییەکی درندە بوو. ئەوان بەهۆی تا، لە کانەکاندا لەژێر قامچی گرێگرێداردا دەمردن. دوا دوو کەسیشیان دوای هەڵهاتنیان مردن، دوای ئەوەی لە شەڕدا لەگەڵ کۆزاخەکاندا کوژران. ئیدی تەنها سوبیێنکۆڤ توانی بە پاسەپۆرت و پارەی دزراوی ئەو موسافیرەی بە ڕاکشاویی لەسەر بەفرەکە بەجێیهێشتبوو، خۆی بگەیەنێتە کامچاتکا.

هەرگیز درندەیی لە ژیانی نەبووەوە. بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە لەنێو ئەو درندایەتییەدا زنجیرکرابوو، لەکاتێکدا دڵی لای گەلەری، شانۆو ئاهەنگەکان بوو. ژیانی خۆی بە خوێن کڕیبووەوە. وەك ئەوانی تر خەڵکی کوشتبوو، کابرای موسافیری کوشتبوو بۆئەوەی دەست بەسەر پاسەپۆرتەکەیدا بگرێت. لای فەروودزەکانیش کارامەیی خۆی سەلماند بوو، بەوەی لە یەك رۆژدا بە شەرتی مردن زۆرانی لەگەڵ دوو ئەفسەری ڕوسیدا گرتبوو، تا لای فەروودزەکان پلەو پایە بەدەستبهێنێت. چونکە لەدوایەوە ئەو ڕێگایە هەبوو بۆ ماوەی هەزاران ساڵ بە نێو سیبیریاو ڕوسیادا درێژ دەبووەوەو جگە لە ڕۆشتن بۆ پێشەوە بە دەریای «بیرین»ی تاریك و بەستودا بەرەو ئالاسکا بەولاوە، هیچ ڕێگایەکی تر بۆ هەڵهاتن بوونی نەبوو.
ڕێگاکە لە درندەییەکەوە بۆ درندەییەکی خراپتر لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتبوو. بەبێ خواردن و بەبێ ئاو بەسەر کەشتی گەنیوی فەروودزەکانەوە بوو. پیاوان لە ململانێ لەگەڵ شەپۆلی بێکۆتایی ئاووهەوای خراپ بەسەر دەریایەکی هەڵچودا دەگۆڕان و دەبوون بە ئاژەڵ. ئەوان سێ جار بە کەشتی



چارۆکەدار لە کامچاتکاوە بەرەو ڕۆژهەڵات چووبوون، هەر سێ جارەکەش دوای ئەوەی هەموو شێوەیەکی نەهامەتی‌و حەسرەتێکی زۆریان چەشتبوو، ئەوانەی بە زیندوویی مابوونەوە، دووبارە بۆ کامچاتکا گەڕابوونەوە. هیچ بوارێك نەبوو بۆ هەڵهاتن و هیچ هیوایەکیشی نەبوو بە گەڕانەوە بۆ ئەو جێگایەی لێوەی هاتبوو، چونکە کانەکان‌و قامچییە گرێگرێدارەکان لە چاوەڕوانی ئەودا بوون.

هەمدیسان، بۆ جاری چوارەم و دواجار، بە کەشتی بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆشت. لەگەڵ هەمان ئەو کەسانەی، کە پێکەوە بۆ یەکەم جار دوورگەی ئەفسانەیی سێلیان دۆزییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوان نەگەڕابووەوە دواوە تا ئەو سامانەی بەهۆی ئەو فەرووە زۆرو زەبەندانەی دەستیان کەوتبوو، لە ئاهەنگی گەمژانە لە کامچاکا بەفیڕۆ بدات. سوێندی خواردبوو هەرگیز نەگەڕێتە دواوە. بە خۆی دەیزانی دەبێت بەردەوام بێت بۆئەوەی جاریکی تر بگاتە بە پایتەختە دڵگیرەکانی ئەوروپا. واتا دەبێت بەرەو پێشەوە بڕوات. لەبەرئەوە کەشتی گۆڕیبوو لەو وڵاتە تاریکەدا مابووەوە. هەڤاڵەکانی ڕاوچی سلۆڤیانی و سەرەڕۆی ڕووسی، مەغۆل‌و تەتەرو دانیشتوانی ڕەسەنی سیبیریایی بوون‌و ئەوانە ڕێگایەکی خوێنینیان بەنێو دڕندەکانی دونیا تازەکەدا بڕیبوو. گوندی وا هەبوو ئەمان سەرلەبەر دانیشتوانەکەیان سەربڕیبوو، تەنها لەبەرئەوەی بە فەروو باجیان بەمان نەدابوو. ئەمانیش بۆ خۆیان لەلایەن سەرنشینانی کەشتیی دیکەوە دەکوژران. ئەم‌و فینلەندییەك تاقانە دوو کەس بوون توانیبێتیان لە سەرنشینانی کەشتییەکی لەو بابەتە بە زیندوویی ڕزگاریان بێت و ناچاربوون هەموو زستانەکەیان لە دوورگەیەکی دوورەپەرێزی ئەلیوتەکان بە تەنهایی و برسێتی ببەنەسەرو دوای ئەوە، لە دەمەو بەهاردا لەلایەن کەشتییەکی ترەوە ڕزگار بکرێن. ئەمەش کاری بەخت بوو.

بەڵام سوبێنکۆڤ هەردەم لەنێو ئەو بەربەرییەتەدا بەند کرابوو. لە کەشتییەکەوە بۆ کەشتییەکی تر دەچوو هەرگیز ملیشی بەگەڕانەوە نەدەدا... تا سەرئەنجام لە کەشتییەکدا بوو، کە توێژینەوەی لەسەر هەموو کەناری خواروی ئالاسکا دەکرد و لە گرووپی دڕەندەکان زیاتر ڕێکەوتی هیچ شتێکی تریان نەکردبوو. هەر جارێکیش لەنێوان دوورگە لێژەکان یان لەپاڵ قەمە شاخە



ڕووتوقوتەکان لەنگەریان گرتبا، مانای شەڕ یان زریان بوو. یاخود لەلایەن دانیشتوانی ڕەسەنی دوورگەکانەوە، کە دەموچاویان بۆ شەڕ ڕەنگ کردبووو بەلەمەکانیان بۆ نێو ئاوەکە تاودەدا، هاتبوون بۆئەوەی لەلایەن باروتی کەشتینشینە گەڕۆکەکانەوە، فێری وانەیەکی خوێناوی بن.
بەرەو خوار بەتەنیشت کەنار و بە کەشتی چارۆکەدارەوە لە ڕۆشتن بەردەوام بوون تا لە زەوی کالیفۆرنیای ئەفسانەیی نزیک بوونەوە. لێرەدا، وەك دەڵێن سەرچڵە ئیسپانییەکان لە مەکسیکەوە بە شەڕ ڕێگای خۆیان بەرەو باکور کردبووەوە.. ئەو ئومێدی بەو ئیسپانییە سەرەڕۆیانە بوو، بیری لەوە کردەوە سەرەتا هانا بۆ ناوچەکانی ئەوان بەرێت، ئیتر ئەوەو دوای ئاسانە. گرنگ نییە چەند لە مەکسیك دەمێنێتەوە، ساڵێك... دوو ساڵ، چ گرنگییەکی هەیە. چونکە لەوێوە سواری کەشتییەك دەبێتو ئەورووپاش دەبێت بە هی ئەو. بەڵام ئەوان ڕێکەوتی هیچ ئیسپانییەکیان نەکرد.
ئەوان ڕووبەڕووی هەمان دیواری سەختی



بەربەرییەکان بوونەوە. دانیشتوانی دەموچاو ڕەنگکراو بۆ شەڕ لە سنووری ئەوپەڕی دونیادا، لە کەنارەکاندا ڕاویان نابوون‌و دووریان خستبونەوە. تا لە کۆتاییدا، ئەوکاتەی کەشتییەك ژێر ئاو دەکەوێت و هەموو سەرنشینەکانی دەکوژرێن، ناخودای کەشتییەکە دەست لە گەڕان هەڵدەگرێت و بە بەلەم بەرەو باکوور دەکشێتەوە.
ساڵ هاتو ساڵ چوو. ئەوکاتەی قەڵای میخایلۆڤسکی ڕێدۆوبت دروستکرا، ئەم لەلای تێبینکۆف خزمەتی دەکرد. دوو ساڵی لە کوسکۆکڤیم بەسەربرد. دوو هاوین لە ماوەی مانگی یونیدا توانیبووی لەدەم دەربەندی کۆتزیبوێ بمێنێتەوە. لەوکاتانەدا خێڵەکان لەو جێگایەدا کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی ئاڵوگۆڕی شتومەك بکەن. لێرەدا مرۆ دەیتوانی دەستی لە چەرمی ئاسکی بەڵەکی سیبیریایی، عاجی دورگەکانی دیۆمێدیس، چەرمی شێری دەریایی کەنارەکانی دەریای بەستووی باکوورو چرای بەردینی سەیر بدات، کە لە مامەڵەی نێوان خێڵەکاندا دەگۆڕدرانەوە، بەڵام هیچ کەسێك نەیدەزانی ئەو چرا بەردینانە لە کوێوە هاتوون یاخود بۆ کوێیان دەبردن، لە دەرفەتێکیشدا دەستی لە چەقۆیەکی ڕاوی بەرهەمی ئینگلیزی گیردەبێت. سوبیێنکۆڤ دەیزانی، ئێرە ئەو خوێندنگایەی لێیە، تیایدا فێری جوگرافیا دەبێت. چاوی بە ئەسکیمۆکانی دەربەندی نۆرتون، خەڵکی دوورگەی کینگو دورگەکانی

سانت لاورێنس، خەڵکی پرینس ئۆڤ وێلس و خەڵکی پۆینت بارۆ دەکەوێت. ئەو شوێنانە ناوی تریان هەیە و ماوەی نێوانیان بە ڕۆژەڕێ دەپێورێن.
ئەو بازرگانە دڕندانە لە شوێنی دوورو چەپەکەوە هاتبوون تا بازرگانی بە چرای بەردینو چەقۆی پۆڵایینەوە بکەن.. سوبیێنکۆڤ خەریکی شاتوشوتو ماستاوکردنو ڕەشوەپێدان بوو. هەموو ئەوانەی لە ڕێگای دوورەوە هاتبوونو ئەندامانی خێڵە نەناسراوەکانن، دەهێنرانە لای ئەو. باسی شتی وا ترسناکیان بۆ دەکرد، کە بە عەقڵی هیچ کەسێکدا نەدەچوو، بۆ نموونە: باسی گیانەوەری دڕندە، خێڵی دوژمنکارانە، دارستانی چڕ کە ڕێدەرنابەی تێیدا، زنجیرە چیای مەزنیان دەکرد. بەڵام دوای ئەو هەموو شتانە هەردەم دەنگۆی مرۆڤی پێست سپی سەری هەڵدەدا؛ ئەوانەی چاویان شینە و پرچیان زەردە، وەکو شەیتانی نەعلەتی دەجەنگان و هەردەم بەدوای شتومەکی لە فەروو دروستکراوەوەن.
ئەوانە لە ڕۆژهەڵاتدا هەن ـ زۆر، زۆر دوور لە ڕۆژهەڵاتدا. هیچ کەسێ نەیبینیون. بەڵام حیکایەتەکەیان لەناو خەڵکیدا بڵاوبوو.
قوتابخانەکە قورس بوو. ئاسان نەبوو مرۆڤ لەناو ئەو هەموو دیالێکتە سەیرانەدا فێری جوگرافیا بێت. لەلایەن مرۆڤگەلێکەوە فێربێت، کە ئەفسانە و واقیع تێکەڵ دەکەن و دووری نێوان جێگاکان بە ژمارەی شەونخونی دەپێون، ماوەکانیش گۆڕانیان بەسەر دێت و ئەویش پەیوەستە بەوەی چەندێ گەیشتن بەو جێگایە سەختە. بەڵام لە کۆتاییدا ئەو چپەیە بیسترا، کە غیرەتی دایەبەر سوبیێنکۆڤ. لە ڕۆژهەڵاتدا ڕووبارێکی گەورە هەیە ئەو چاوشینانە لە کەنارەکانیدا نیشتەجێن. ڕووبارەکە یوکۆنیان پێدەوت. لە خوار قەڵای میخایلۆڤسکی ڕێدۆیت ڕووبارێکی تری گەورە هەبوو، کە ڕووسەکان کویکپاکی پێدەڵێن، ویتەویتەکان دەیانوت لە ڕاستیدا ئەو دوو ڕووبارە هەر یەك ڕووبارن. سوبیێنکۆڤ، بۆ میخایلۆڤسکی گەڕایەوە دواوە. لە ماوەی یەك ساڵی ڕەبەق بە جۆشەوە هانی خەڵکی دەدا بە جەولەیەکی پشکنین بەرەو سەرەوەی ڕووباری کویکپاك بچن.
دواتر مالاکۆڤ هات، ڕووسە دووڕەگەکە، تا سەرۆکایەتی توندوتیژترین، تەماعکارترین و دڕو شەڕانی ترین تاقم بکات، کە لە کامچاتکاوە پەڕیبوونەوە، وەك ئەوەی لە دۆزەخەوە هاتبن. سوبیێنکۆڤ نزیکترین کەس بوو لەوەوە. پێچەبەدەرە گەورەکەی دەلتای کویکپاکیان پشکنی. شارەزاییان لەبارەی چیا نزمەکان



بەدەستهێناو نیو هەزار میلی ئینگلیزی بە بەلەمی لە چەرم دروستکراو، کە تا لێواری سەرەوەی بەلەمەکان بە شتومەکی بازرگانیو فیشەکو تەقەمەنی هەڵچنرابوو، پێچەوانەی ڕووبارەکە ڕۆشتن. مالاکۆف بڕیاریدا قەڵاکە لە نولانۆ دروست بکات. سوبیێنکۆڤ هانی مالاکۆفی دابوو پێشڕەوی زیاتر بکەن. بەڵام خێرا بە سەرزەمینی نۆلانۆ ڕازی بوو. زستانی درێژ بەڕێوەیە. چاوەڕوانی کردن باشتر بوو. پێش وەختی هاوینی داهاتوو، ئەوکاتەی سەهۆڵی سەر ڕووبارەکە نەمابوو، خۆی لە کویکپاك گوم کرد، توانی بە کارکردن خۆی بگەیەنێتە شوێنی کۆمپانیای هادسون بایکۆمپانی. مالاکۆڤ نە لە سوبیێنکۆڤو نە هیچ کەسێکی تر دەنگۆی ئەوەی نەبیستبوو، کە کویکپاکو یوکۆن یەك ڕووبارن.
ئیتر قەڵاکە دروستکرا. کارێکی زۆرە ملێ بوو. دیواری دارینی قەڵاکە لەسەر ئاهونالەی هیندییە سوورەکانی نولاتۆوە بەرز دەبووەوە، کە قامچی بەسەر پشتیاندا دەباری، ئەو قامچییانەی دەستی پۆڵاینی چەتە دەریاییەکان گرتبووی. هیندیی سوور هەبوو هەڵدەهاتو ئەوکاتەی دەیانگرت و دەیانهێنایەوە، لەبەردەم قەڵاکە بە ڕووتی ڕایاندەگرت و لەوێدا ئەوانو خێڵەکەیان فێری ئەوە دەبوون، کە قامچی گرێگرێدار چەند کاریگەرە. دووان لەژێر ئەشکەنجەدا مردن. هەندێکیان تا لە ژیاندا مابوون بە سەقەتی مانەوە. ئەوانی تر وانەکەیان بە دڵ وەرگرتو لەوە زیاتر هەڵنەهاتن. بەر لەوەی قەڵاکە بەتەواوەتی دروست بکرێت، یەکەم کلوە بەفر باری و ئەوکاتەش کاتی فەروو کۆکردنەوە بوو. باجێکی قورس لە خێڵەکە داوا کرا. کوشتن و بڕینو تێهەڵدان بەردەوام بووو بۆ ئەوەشی باجەکە بدرێت، ژنو منداڵەکانیان بە بارمتە گلدابووەوەو بە شێوەیەکی بەربەری وا هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردن، کە تەنها فەروودزەکان دەیانزانی.
بەڵێ، پێشتر خوێنییان تۆو کردبوو، هەنوکە کاتی درەوکردنێتی. قەڵاکە نەمابوو. نیوەی فەروودزەکان لەبەر ڕووناکی سوتانی قەڵاکە کوژرابوون. نیوەکەی تریشیان لەژێر ئەشکەنجە گیانیان دابوو. بەتەنها سوبیێنکۆڤ مابووەوە، یاخود سوبیێنکۆڤ و ئیڤانە زلە مابوونەوە، ئەگەر بێتو مرۆ ئەو شتە بۆڵەبۆڵکەرو نوزەنوزکەرەی لەنێو بەفرەکەدا کەوتبوو، بە ئیڤانە زلە بانگ بکات. سوبیێنکۆڤ چاوی لێ بوو چۆن یاکاگا لەبەرامبەریدا بزەیەکی گاڵتەجاڕی بۆ دەکات. هیچ کەسێك نەبوو تا بەر لە یاکاگا بگرێت. نیشانەی لێدانی



گرێی قامچییەکان هێشتا بەسەر دەموچاوییەوە مابوونەوە. لەڕاستیدا سوبییێنکۆڤ نەیدەتوانی لۆمەی یاکاگا بکات، بەڵام حەزی لە بیرکردنەوەی ئەوە نەبوو، کە دەبێ یاکاگا چی لێ بکات. بیری لەوە دەکردەوە، کە لە ماکاموك، گەورە سەرۆك خێڵ بپاڕێتەوە، بەڵام بێسودە. دواتر بیری لەوە دەکردەوە دەستی بپچڕێنێت و تا مردن لەگەڵیان بجەنگێت. ئەمەش خێرا کۆتاییەکەی دەهێنێت. بەڵام ئەو نەیدەتوانی ئەو پەتەی دەست و قاچی پێ بەستراوەتەوە، بکاتەوە. لە کاتی بیرکردنەوەدا شتێکی تری بە خەیاڵدا هات. بە دەست ئاماژەی بۆ ماکاموك کردو داوای لێکرد وەرگێڕێك، کە دیالێکتی کەنار دەریا دەزانێ، بهێنن.

سوبییێنکۆڤ وتی: ئای ماکاموك، ئارەزووی مردنم نییە. من پیاوێکی مەزنمو زۆر گەمژەییە بۆ من بمرم. ڕاستییەکەی ئەوەیە من نامرم. من وەکو ئەو بەدفەڕانەی تر نیم.

تەماشای ئەو شتە نوزەنوزکەرەی کرد، جارێك لە جاران ئیڤانە زلە بووەو بە سوکایەتی پێکردنەوە بە پەنجەی پێ تێیژەنی: من لەوە ژیرترم تا بمرم. دەزانی، من دەرمانێکی چاکم هەیە. بە تەنها من بەو دەرمانە دەزانم. لەبەرئەوەی من نامرم، من ئەو دەرمانەت لەگەڵدا دەگۆڕمەوە.

ماکاموك ئەمری بەسەردا کرد: ئەوە چ دەرمانێکە؟

ئەوە دەرمانێکی سەیرە. سوبییێنکۆڤ بۆ یەك چاوتروکان، هەروەکو بڵێی مەیلی ئەوەی نەبێت نهێنییەکەی خۆی ئاشکرا بکات، لەگەڵ خۆی کۆششی کرد: من ئەوەت بۆ دەگێڕمەوە. ئەگەر بێتو یەك تۆزقاڵ لەو دەرمانە بهێنی بە پێستتدا ئەوا پشتت وەکو بەرد یان ئاسن ڕەق دەبێت، کە هیچ چەکێکی تیژ نەتوانێ بیبڕێت. بەهێزترین پیاکێشانی تیژترین چەك لەبەرامبەریدا کاریگەری نییە. چەقۆیەکی لە ئێسقان دروستکراو وەکو پارچەیەك قوڕی لێ دێتو دەمی چەقۆیەکی لە پۆڵا دروسکراو لەو جۆرانەی ئێمە بۆ ئێوە پێمان بوو، دەچەمێتەوە. بۆ نهێنی ئەو دەرمانە دەتەوێت چیم پێ بدەیت؟

ماکاموك بەیارمەتی وەرگێڕەکە وەڵامی دایەوە: من ژیانی خۆتت پێ دەبەخشم.

سوبییێنکۆڤ بە گاڵتەجاڕییەوە پێدەکەنی. وتی: دەستوپێم بکەرەوە باپێکەوە قسە بکەین.

سەرۆك خێڵ هیمایەکی کرد و ئەوکاتەی سوبییێنکۆڤ ئازاد کرا.



جگەرەیەکی پێچایەوەو دایگیرساند.
ماکاموك وتی: قسەکانی تۆ شێتانەیە. هیچ دەرمانێکی لەو بابەتە بوونی نییە. ناکرێت بوونی هەبێت. دەمە چەقۆیەکی تیژ لە هەموو داوودەرمانێك بەهێزترە.
سەرۆك خێڵەکە پێشنیارەکەی بەدڵ نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ملی بۆ دا. لە ڕادە بەدەر زۆڵێتی فەروودزەکانی بینیوە. نەیدەتوانی بە تەواوەتی گومان بکات.
ئەمەی پێڕاگەیاند: من ژیانی خۆتت پێدەدەمەوە، بەڵام تۆ نابیت بە کۆیلەی من.
«لەوە زیاتر».
سوبیێنکۆڤ بە شێوەیەکی وا سارد یارییەکەی خۆی دەکرد، کە هەر وەکو بڵێی مامەڵەی چەرمی ڕێوییەك بکات. «ئەوە دەرمانێکی زۆر گەورەیە. گەلێك جار ژیانی منی ڕزگار کردووە. من تاخورکێك بە سەگەکانەوەو شەش لە ڕاوچییەکانتم دەوێت، تا جێگایەك لەگەڵم کەون، کە یەك شەونخونی لە میخایلۆڤسکی ڕێدۆوبتەوە دوورە«.
ئاوەها وەڵامی درایەوە: تۆ دەبێ لێرە بمێنیتەوەو ئێمە فێری هەرچی شتی شەیتانیت هەیە، بکەیت.
سوبیێنکۆڤ شانی بۆ هەڵتەکاندو بە بێدەنگی مایەوە. دەبێت نەفەسی جگەرەکە لەنێو ئەو هەوا ساردەدا بە با بدات، نیگایەکی فزولییانەشی بە لای ئەوەی لە کۆزاخەکە مابووەوە، کرد.
لە پڕێکدا ماکاموك هیمای بۆ ملی پۆلەنییەکە کرد، شوێنی برینێکی بلێسەدار فیتنەیی لەسەر ئەوە کرد، کە سوبێینکۆڤ لەکاتی شەڕە چەقۆکردنێك لە کامپاکا، پێکراوە. «ئا ئەوە شوێنی چەقۆیە. دەرمانەکە باش نییە. دەرمانەکە لە دەمی چەقۆکە بەقوەتتر نییە«.
سوبیێنکۆڤ باش بیری لێ کردەوە: ئەو کەسە پیاوێکی بەهێز بوو، کە چەقۆکەی لێدام. لە تۆ بەهێزتر، لە بەهێزترین کەس لە ڕاوچییەکانت بەهێزتر، لەو بەهێزتر.
هەمدیسانەوە پەنجەی پێی بەر چەرمەکەی لای کۆزاخەکە کەوت ـ ئەو دیاردە ترسناکەی، کە ئیتر هیچ هۆشێکی بەبەردا نەمابوو، بەڵام ژیان، لەنێو لەشی لە پەلوپۆ کەوتووی دوای ئەشکەنجەدان، دەستی خۆی گیرکردبووو نەیدەویست بە ئارەزووی خۆی دەستی لێ بەربدات.
(دەرمانەکە بێهێزیش بوو. چونکە لەو جێگایەدا هەندێ بەری ڕووەك نەبوو، کە لە جۆرێکی تایبەتە، من دەبینم لە وڵاتی ئێوە بەلێشاو هەیە. لێرە دەرمانەکە زۆر



بەهێز دەبێت.
ماکاموك وتی: من ڕێگات پێدەدەم بە ڕووبارەکەدا بەرەو سەرەوە سەربکەویت، تاخوڕك و سەگەکان و ئەو شەش ڕاوچییانەی دەبێ بتپارێزن، پێتدەدرێت.
یەکاویەك ئەم وەڵامە ساردەی بەدوادا هات: تۆ خاوەخاوت کرد. تۆ سوکایەتیت بە دەرمانەکەی من کرد. چونکە تۆ، ئەوکاتە بە مەرجەکانی من ڕازی نەبوویت. لەبەرئەوە گوێ بگرە، من داخوازی زیاترم هەیە. من چەرمی سەد سەگلاوم دەوێت.
بە گاڵتەجاڕییانە زەردەخەی بۆ کرد: سەد پاوەن ماسی وشك کراوم دەوێت. ماکاموك سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاند، چونکە گەلێك لەو ماسییەیان هەبوو، زۆر بە ئاسانی ڕاو دەکرێت. (دوو تاخوڕکم دەوێت ـ یەکێکیان بۆ خۆمو ئەوی تریشیان بۆ فەرووو ماسییەکانم. دەبێ تفەنگەکەشم بۆ بگەڕێندرێتەوە. ئەگەر تۆ یەکسەر ڕازی نەبیت، ئەوا نرخەکەی خێرا هەڵدەکشێت.
یاکاگا چپاندییە گوێی سەرۆك خێڵەکەوە.
ماکاموك پرسی: باشە ئێمە چۆن بزانین، کە دەرمانەکەی تۆ بەڕاستی کاریگەرە؟
«زۆر ئاسانە. سەرەتا من دەچم بۆ نێو دارستان».
هەمدیسانەوە یاکاگا چپاندییە گوێی ماکاموکەوە، کە بە گومانکردنو بیرکردنەوەوە ڕستەیەکی جیاوازی دەربڕی.
سوبییێنکۆڤ بەردەوام بوو لە قسەکردن: تۆ دەتوانی بیست لە ڕاوچییەکانت لەگەڵم بنێری تا چاودێریم بکەن. تۆ دەزانی، من دەبێ ئەو بەری ڕووەك و ڕەگانەی من دەرمانەکەی پێ دروست دەکەم، پەیدا بکەم. پاشان دوای ئەوەی تۆ تفەنگەکەمو دوو تاخوڕك لە ماسیو چەرمی سەگلاوم دەدەیتێ و ئەو شەش ڕاوچییە هەڵدەبژێری، کە دەبێ دوای من بکەون ـ ئا، ئەوکاتە من ئامادەم. دەرمانەکە بە ملی خۆمدا دەهێنمو ملم دەنێمە سەر ئا ئەو دارە. پاشان دەتوانیت ڕێگە بە بەهێزترین ڕاوچیت بدەی پاچەکە هەڵبگرێتو سێ جار لە ملی بدات. تۆ بە خۆت دەتوانی ئەو سێ جارە لە ملم بدەیت.
ماکاموك بە دەمی داچەقیوەوە وەستابووو وشە بە وشەی دوا بەڵگەی سیحری کەم هاوتای فەروودزەکەی وەرگرت.
پۆڵەنییەکە یەکسەر ئەوەی خستە سەر: بەڵام، دەبێ من بە



خۆم دوای هەر لە مل دانێك دەرمانی تر بە ملمدا بسووم. پاچەکە قورس‌و تیژەو من نامەوێت هیچ هەڵەیەك بکرێت. لەپڕێکدا ماکاموك ڕەزامەندی نیشاندا: هەموو ئەو شتانەی تۆ داوات کردووە، پێت دەدرێت. هاواری کرد: دەست بە دروستکردنی دەرمانەکەت بکە.

سوبییێنکۆڤ شاگەشە بوونی خۆی شاردەوە. یارییەکی زۆر گەورەی دەکردو بۆی نەبوو هیچ هەڵەیەك بکات.

بە لەخۆبایی بوونێکەوە وتی: تۆ زۆر خاوە خاوت کرد، دەرمانەکەی من سوکایەتی پێکراوە. بۆئەوەی لەو گوناحەی بەرامبەر بە دەرمانەکە کردووتە، لێت خۆش بم، دەبێ کچەکەتم پێبدەیت.

پەنجەی بۆ کچەکە درێژ کرد. بوونەوەرێکی تۆزێك سەرنج ڕاکێش بوو، چاوێکی تۆزێ خێل بووو دانێکیشی وەکو هی گورگ رووی کردبووە دەرەوە. ماکاموك تورە بوو، بەڵام پۆلەنییەکە لەسەر دان بە خۆداگرتنی خۆی مایەوە، هەمدیسان جگەرەیەکی تری پێچایەوەو دایگیرساند.

هەڕەشەی کرد: خێراکە، ئەگەر دەستوبرد نەبیت، ئەوا لەوە زیاتر داوا دەکەم.

لەنێو ئەو بێدەنگییەی بەدوای ئەوەدا هات، ئەو دیمەنە دڵتەنگەی باکووری دونیا کاڵبووەوە. لەناخی خۆیەوە هەمدیسان نیشتمان‌و فەرەنسای بینییەوەو ئەوکاتەی ئەو کیژەی دانێکی وەك هی گورگ بوو، بینی، کیژێکی تری گۆرانیبێژو سەماکەری بیرکەوتەوە، کە جارێك لە جاران لەوکاتەی بەگەنجی هاتبووە پاریس‌و ئاشنایی لەگەڵدا پەیدا کردبوو.

ماکاموك لێی پرسی: کیژەکەت بۆ چییە؟

سوبییێنکۆڤ بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە لە کچەکەی ڕوانی: بۆئەوەی لەوکاتەی بەرەو خواری ڕووبارەکە دەڕۆم، لەگەڵمدا بێت. ئەو کیژە دەبێ ببێت بە ژنێکی باش و ژن و ژنخوازی لەگەڵ تۆدا بکەم و سەربەرزییە خوێنمان تێکەڵ بێت، کە بایی نرخی دەرمانەکەی منە.

هەمدیسان کیژەکەی وەبیرکەوتەوە، کە گۆرانی دەچڕی‌و سەمای دەکردو لەبەرخۆیەوەو بە دەنگی بەرز نارەناری گۆرانییەکی تری دەوتەوە، کە ئەو کیژە فێری کردبوو. دووبارە ئەو ژیانەی جارانی خۆی ژیایەوە، بەڵام بە شێوەیەکی دوورەپەرێز و ناشەخسییانەوە و وێنەی یادەوەرییەکانی نێو ژیانی خۆی دەبینی، کە هەروەکو بڵێی لەنێو کتێبێك لە بارەی ژیانی کەسێکی ترەوە بێت. لە پڕێکدا دەنگی سەرۆك خێڵەکە بێدەنگییەکەی



بڕی، وای لەم کرد، ڕابچڵەکێت.
ماکامۆك وتی: با وابێت. لەوکاتەی بەرەو خواری ڕووبارەکە دەڕۆیت، کیژەکە لەگەڵ خۆت دەبەیت، بەڵام دەبێ ئەوەت لەلا ڕوونو ئاشکرا بێت، کە من بیرم لەوە کردووەتەوە، خۆم بەو پاچە سێ جار لە ملت دەدەم.
بەڵام دەبێ لە ماوەی نێوان هەر پاچ لێدانێکدا بە دەرمانەکە ملمی پێ چەوربکەیتەوە.
سۆبیێنکۆڤ بە شێوەیەکی وا ئەمەی وت، بەوەی دەکرد نیگەرانییەك، خراپ شاردرابێتەوە.
لە ماوەی نێوان هەر لێدانێك، دەرمانی تر بە ملتدا دەهێنم. لێرەدا ڕاوچی وای لێیە چاودێری ئەوە بکەن، کە تۆ نەتوانی هەڵبێیت. بڕۆ نێو دارستانەکە و دەرمانەکانی خۆت بچنەوە.
تەماعکاریی پۆڵەنییەکە، ماکامۆکی لە بارەی باوەڕهێنان بە هێزی دەرمانەکە، دڵنییاکردەوە. جگە لەو دەرمانە هیچ شتێکی تر نەبوو وا لە مرۆڤ بکات لە سێبەری مەرگدا مامەڵەی ژیان بکات.
لەوکاتەی پۆڵەنییەکە بە خۆیو پاسەوانەکانییەوە لەپشت دار سنەوبەرەکانەوە ونبوون، یاکاگا بە گوێی ماکاموکدا چپاندی: جگە لەوەش، ئەوجا دوای ئەوەی فێری دەرمانەکان دەبیت، زۆر بە ئاسانی دەتوانی لەناوی بەریت.
ماکاموك وەڵامیدایە: بەڵام چۆن بتوانم لەناوی بەرم؟ دەرمانەکەی ئەو ڕێگا بەوە نادات.
یاکاگا وەڵامیدایەوە: هەموو کاتێك جێگایەك دەبێت ئەو دەرمانی پێدا نەهێنابێت. ئێمە لەو پارچەیەی لەشی دەدەین تا بیکوژین. ڕەنگبێ ئەوە گوێی بێت. ئا بەڵێ ڕەنگە بەتەواوەتی ئەوە بێ. ئێمە تیرێك دەچەقێنینە نێو گوێیەکییەوەو لەوی تریانەوە دەریدەهێنین. یاخود ڕەنگە چاوی بێت. بە دڵنیاییەوە دەرمانەکە بەتەواوەتی تیژە و ناکرێت بە چاودا بهێنرێت.
سەرۆك خێڵەکە سەری بۆ لەقاند: تۆ زرنگیت، یاکاگا، بەس ئەگەر بێتو ئەو خاوەنی شتێکی تری ئاوەها شەیتانانە نەبێت، لەوکاتەی ئێمە لەناوی دەبەین.
ئەو دەمەی سوبیێنکۆڤ خەریکی کۆکردنەوەی کەرەستەکانی دەرمانەکەی بوو، بە هیچ شێوەیەك کاتی بەفیڕۆ نەدەدا.



به شێوەیەکی گشتی هەر شتێك بهاتایەتە بەردەست، هەڵیدەبژاردو دەیچنییەوە. شتی وەکو گەڵای دەرزیلەیی سنەوبەر، توێکڵی ژێرەوەی دەوەنی بی، تیلمێك لە توێکڵی داربێتولا. یەك حەمکە بەری خورپەچنە، وای لە ڕاوچییەکان کردبوو، ئەوانیش بۆ خۆیان لەژێر ئەو بەفرەی زەوییەکەی پۆشیبوو، بە هەڵکۆڵین دەریبێنن. هەندێك ڕەگی سەرمابردوو زەخیرەکەی تەواو کرد و پێش ئەوانی تر دووبارە گەڕایەوە دواوە بۆ ئۆردوگاکە.

ماکامۆكو یاکاگا لە تەنیشتییەوە چەمابوونەوە. سۆبییێنکۆڤ ئەو کەرەستانەی سوبییێنکۆڤ لە نێو مەنجەڵێك، کە ئاوی کوڵاوی تیادا بوو، هەڵدەڕشت، ئەوانیش کەرەستەکانیان یاداشت دەکرد.

ئەوەی بۆ ڕونکردنەوە: گرنگە یەکەم جار بەری خورپەچنە لە مەنجەڵەکە نرێ. هەروەها ئا بەڵێ شتێکی تریش ـ پەنجەی پیاوێك. لێرەدا یاکاگا، ڕێگام بدە پەنجەت ببڕمەوە.

بەڵام یاکاگا دەستی بۆ پشتی خۆی بردو زۆر ترسناك دەهاتە پێشچاو.

سوبییێنکۆڤ دەپاڕایەوە: تەنها پەنجەیەکی بچکۆلانە.

ماکاموك فەرمانیدا: یاکاگا، پەنجەکەتی پێبدە.

یاکاگا کردی بە بۆڵە بۆڵو هێماشی بۆ پاشماوەی ئەو هەموو دەرزەنە خەڵکەی لەسەر بەفرەکە کەوتبوون و تا مردن ئەشکەنجە درابوون، کرد: یەك حەمکە پەنجە لەم دەوروبەرەدا هەیە.

«دەبێ پەنجەکە هی پیاوێکی زیندوو بێت».

یاکاگا چوو بۆ لای کۆزاخەکە و پەنجەیەکی ئەوی بڕییەوە.



ئەو یادگارییە پیرۆزە خوێناوییەی بۆ پۆڵەنییەکە فڕێدایە سەر بەفرەکەو ڕونیشی کردەوە: هێشتا نەمردووە.

هەروەها پەنجەیەکی باشە چونکە ئەستورە.

سوبییێنکۆڤ لەژێر مەنجەڵەکەوە خستییە سەر ئاگرەکەوە و دەستی بە گۆرانی چڕین کرد.

گۆرانییەکی عەشقی فەرەنسی بوو، بە شکۆوە بەسەر مەنجەڵی سەر ئاگرەکەوە دەیچڕی.

ڕوونی کردەوە: بەبێ ئەم وشانە دەرمانەکە بێ نرخە.

بەهێزترین بەشی ئەو دەرمانە لە وشە پێکدێت. تەماشاکە هەموو شتێك ئامادە بوو.

ماکاموك داوای لێکرد: لەسەرەخۆ وشەکان دووبارە بکەرەوە، تاوەکو من فێری ببم.

«پێش کۆتایی تاقیکردنەوەکە نا. ئەوکاتەی پاچەکە سێ جار لەسەر پشت ملم هەڵدەبەزێتەوە، ئەوکاتە ئەو وشە نهێنییانەت پێ دەدرێت».

ماكاموك بە پەرێشانییەوە وتی: بەڵام ئەگەر دەرمانەکە دەرمانێکی باش نەبوو.
سوبییێنکۆڤ بە تووڕەییەوە بەری کردە لای ئەووەوە: دەرمانەکەی من هەردەم باشە. ئەگەر بێتو دەرمانەکە بە شێوەیەك لە شێوەکان باش نەبوو، ئەوا ئەوەی لەگەڵ ئەوانی تردا کردتان، لەگەڵ منیشدا بیکەن. هەر جارەو پارچەیەکم لێ بکەنەوە وەك ئەوەی پارچەیەکتان لەو کردەوە. پەنجەی بۆ کۆزاخەکە درێژ کرد: هەنوکە دەرمانەکە سارد بووەتەوە. بۆیە بە گەردنی خۆمیدا دەسووم.
بە زۆر جدییەیەوە لەسەرەخۆ بە ئاوازێکی خۆشەوە سرودی «مارسیلێزی» چڕی، هاوکات زۆر بە ڕێکوپێکی ئەو شتە کولاوە نەعلەتییەی بە پشتی ملی خۆیدا دەساوی.
هاوارێك ئەو نمایشەی ئەوی ڕاگرت. کۆزاخە زەبەلاحەکە بە زۆر لە خۆکردنەوە لەسەر ئەژنۆکانی خۆی وەستا. ئەوکاتەی ئیڤانە زلە لەنێو بەفرەکە لەژێر ڕاچڵەکینی عەجایەبەوە دەستی بە خۆ هەڵدان بەملاو بەولادا کرد.
نۆلانییەکان بە پێکەنینو هاوارو چەپڵەڕێزانی سەرسوڕمانەوە کاردانەوەیان لەبەرامبەریدا نیشاندا.
سوبییێنکۆڤ هەستی بە ناساغی خۆی دەکرد و دڵتێکچونەکەی خۆی شاردەوەو وای نیشاندا، کە تووڕەیە.
سوبییێنکۆڤ وتی: ئەوە بەکەڵك نایەت. کۆتایی پێبهێنەو ئەوجا دەرمانەکە تاقی دەکەینەوە. یاکاگا سەرپەرشتی ئەوە بکە تا ئەو هاتوهاوارە کۆتایی پێدێت.
دوای ئەوەی ئەوە جێبەجێ کرا، سوبییێنکۆڤ ڕووی کردە ماکاموك: لەبیرت نەچێ، دەبێ زۆر بە قایمی لە ملم بدەیت. ئا ئەمە کاری منداڵ و مەزم نییە. ئەوەتا پاچەکە بگرە دەستو بە هێزمەکەیدا بکێشە تاوەکو ببینم، کە تۆ وەکو پیاو پاچ دەوەشێنیت.
ماکاموك فەرمایشتی ئەوی بەجێهێنا، دووجار بێخەوش و بە هێز، پاچەکەی وەشاند، بەشێوەیەك چڵیشێکی ئەستوری لێ داماڵی.
سوبییێنکۆڤ تەماشای ئەو بازنەیەی دەکرد ئەنلیتە دڕندەکان دروستیان کردبوو، بە شێوەیەك لە شێوەکان بە سیمبولی ئەو دیوارە بەربەرییەی دەکرد، کە هەر کاتی خۆی پۆلیسی قەیسەر بۆ یەکەمین جار لە وارشۆ دەستگیریان کردبوو، تیایدا بەند بووە. «زۆر باش بوو. پاچەکەت بگرە دەستەوە، ماکاموك، لەوێ ڕاوەستە. من لەسەر زەوییەکە ڕادەکشێم. ئەوکاتەی من دەستم



بەرز دەکەمەوە، هەرچەندە هێزت تیایە لە ملم دەدەیت. ئاگاداربە نەوەکا کەسێك لە پشتتەوە وەستابێت. دەرمانەکە چاکەو ڕەنگە پاچەکە لەسەر پشتی ملی من هەڵبەزێتەوەو لە دەستی تۆ دەربچێت.»

لەو دوو تاخورکە رامابوو سەگەکانی پێوە بەسترابوونەوە و لە فەروو و ماسی بارکرا بوون. تفەنگەکەی لەسەر چەرمی سەگلاوەکان دانرابوو. ئەو شەش ڕاوچییەی دەبووایە ببن بە پاسەوانی، بە تەنیشت تاخورکەکانەوە وەستابوون.

پۆڵەنییەکە بە فەرمایشت کردنەوە وتی: کوانێ کچەکەت؟ بەرلەوەی تاقی کردنەوەکە بەردەوام بێت، بەتەنیشت تاخورکەکەوە ڕایگرە.

ئەوکاتەی ئەو شتە کرا، سوبیێنکۆڤ لەسەر بەفرەکە ڕاکشاو وەکو منداڵێکی ماندوو، کە دەیەوێت بنوێ، سەری لەسەر هێزمەکە دانا. گەلێك سالآنی ناخۆشی بردبووە سەر، لێرەدا بەڕاستی ماندوو بوو.

سوبیێنکۆڤ وتی: من بە تۆو بە هێزی تۆ پێدەکەنم، ئەی ماکاموك. لە ملم بدە.. بە قایمی لە ملم بدە.

دەستی بەرزکردەوە. ماکاموك پاچەکەی بەرزکردەوە، پاچێکی دەم پان بۆئەوە دروستکرابوو تا بە پانی کۆڵەکە داری پێ بتاشرێت. پاچە پۆلاینە تازە لە هەسان دراوەکە، بەسەر سەری ماکاموکەوە بریقەی دەداوو پاشان بەسەر گەردنی ڕووتی سوبیێنکۆڤەوە بەربووەوە. ڕێكو ڕاست گۆشتو ئێسقانی بڕی و لەسەر هێزمەکەی ژێر ملی گیربوو. دڕندە



سەرلێشێواوەکان چاویان لێ بوو چۆن سەرەکە یەك مەتر دوور لە لەشەکەی، کە خوێن فیچقەی لێوە دەکرد، هەڵبەزییەوە.

بوو بەسەرلێشێوان و بێدەنگی، هاوکات لەسەرخۆ لەوە تێگەیشتن هیچ دەرمانێك بوونی نەبووە. فەروودزەکە کلآوی کردبووە سەر هەر هەموویان. وەك تاقانەی نێو هەموو بەندکراوەکان، خۆی لەدەست ئەشکەنجە ڕزگارکرد. ئەمەش یارییەکی براوە بوو کردبووی. زریانێك لە قاقای پێکەنین دەستی پێکرد. ماکاموك لە شەرما سەری شۆڕ کردبوو. فەروودزەکە هەڵیخەڵەتاندبوو. ماکاموك ڕووی وەرچەرخاندو بەلۆژەلۆژو بە سەرشۆڕییەوە ئەوێی بەجێهێشت. ڕووی نەمابوو. تا مرد نیشانەی شەرمەزاری بەدوایەوە بووو لێی نەبووەوە. هەرکاتێکیش لە بەهاران خێڵ کۆدەبوونەوە بۆئەوەی ڕاوە ماسی سالومون بکەن، یاخود بە هاوینان بۆ ئاڵوگۆڕی شتومەك کۆدەبوونەوە، حیکایەتی ئەوەی چۆن فەروودزێك بە هێمنی مرد، تەنها بەهۆی ئەوەی یەك جار





لەلایەن ئابڕوچووەوە لە ملی درابوو، بەردەوام لەدیار ئاگردان دەیانگێڕایەوە. گوێی لە پرسیاری بێشەرمی کەسێك دەبێت بۆ شکاندنەوەی ئەم دەڵێت: ئابڕوچوو کێیە؟ وەڵامەکەشی ئەمە دەبێت: «ئای، ئابڕوچوو. جارێك لە جاران بەرلەوەی سەری فەروودزێك لە ملی بکاتەوە، ناوی ماکاموك بووە».


**سەرچاوە:**

**Novellen (tappa ansiktet) finns ocksa som sida: 99-114 i (Livet pa drift), Noveller, av Jack London, oversattning Bertil Falk, 2003**

شیعر

ماردین ئیبراهیم

تۆ مەچۆ بۆ شەڕ

Barin 2013

## تۆ مەچۆ بۆ شەڕ

**ماردین ئیبراهیم**

**چاپکراوی غەزەلنووس**

ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، لە دووتوێی ١٤٠ لاپەڕەدا، کۆی شیعرەکانی ماردین ئیبراهیم ـ ی لە چاپ دایەوە. ماردین ئیبراهیم لەو نووسەرانەیە، کە کەم دەنووسێت و کەمیش بڵاو دەکاتەوە. ئەم دەفتەرەشیعرییەیش لە نۆ تێکست پێک هاتووە، بە ناونیشانەکانی: «خەدیجە، تۆ مەچۆ بۆ شەڕ، فلاورا و پڵنگەکان، ڕافائیل، پێنج پیاوی وەحشی بووین، خوشکەکانم، تاعوون، یاسەمینەکانی مردن و ماریانا.»

تۆ مەچۆ بۆ شەڕ، لە ماوەی ڕابردوودا و لەماڵی وەفایی، لە هەولێر، بە ئامادەبوونی نووسەر، بڵاو کرایەوە و هەر یەک لە پێشەوا مەحەممەد و بڕوا بەرزنجییش، لە بارەی شیعرەکانەوە کورتەباسێکیان پێشکەش کرد.

ماردین ئیبراهیم، جگە لە شیعر، ڕۆمانیش دەنووسێت. دوو ڕۆمانی بە ناوەکانی «خەونی پیاوە ئێرانییەکان» و «کەوتنی بۆرەقەڵا» وە لە چاپ داوە.

تۆ مەچۆ بۆ شەڕ، ئێستا، لە کتێبفرۆشییەکاندا دەست دەکەوێت.

# ئیستنەبول:
# یادەوەری پیاوێکی نادیار

لە بیست و  سێ ساڵیدا لە ساڵی ١٩٩٦، پاش سەفەرێکی دوور و درێژ بە پاس، وەك پەنابەرێکی قاچاخ، گەشتمە جێگایەك پێیان دەگوت ئۆتۆگار. بە پێچەوانەی سەفەرەکەی کا لە رۆمانی بەفری ئۆرهان پاموکدا، من لە سنورەوە هاتم بۆ ئەستەنبول. لە دۆخ بایەزیدەوە؛ شاری مەلا مەحمودی بایەزیدی، هێندە دوور نییە لە قارس ـەوە، کە کا سەفەری بۆ ئەکات. سەفەری من رەدووکەوتنی خەونێك بوو، لە ڕۆژانی جەنگی یەکتر کوشتن لە کوردستان. من نەهاتم بۆ ئەو شارە بۆ ئەوەی بێم بۆ ئەو شارە. من هاتم بۆ ئەو شارە بۆ ئەوەی برۆم بۆ کیشوەرێکی تر. کە لە سەر پردەکە پەڕینەوە، جوگرافیانە دەچووینە کیشوەرێکی تر بەڵام گۆڕینی جوگرافیا تەنها گۆڕینی جوگرافیا بوو. ئیستەنبول شارێکە، وەك زۆر شاری تر پڕ لە شاری تر لە هەناوی خۆیدا، لە پانتایی تایبەت، بە دەوڵەمەندان، بە هەژاران، بە مامناوەندان، بە ئایینداران، بە عەلمانیان بە سۆزانیان بە ئەوانیتر. کە لە رۆژئاواوە دێت بۆ تورکیا؛ تورکیا رۆژهەلاتیانە دەردەکەوێت. کە لە لە رۆژهەلاتەوە دێیت بۆ تورکیا، بە تایبەت جێگایەکی وەك ئیستەنبول رۆژئاواییانە دەردەکەوێت. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە چەند هەڵەیە دیدی ئێمە بۆ دونیا.

من مرۆڤێکی نایاسایی بووم. نایاسایی بوونم مرۆڤبوونمی خستوە ژێر گومانەوە. لە دونیای ئەمڕۆدا گەر مرۆڤبوون لە شێوەی







هاوولاتیبووندا دەردەکەوێت ئەوا هاوولاتیبوون پەیوەستە بە خاك و سیستەمەوە. مرۆڤ تەنها لە نێو خاك و لە ژێر سیستەمێکدا هاوولاتییە. یان لە ڕاستیدا تەنها لە هەناوی پانتاییەکی تەسکی گۆی زەوی و لە ژێر سایەی چەند سیستەمێکی کەم. من لە سیستەمێکی ناهاوولاتییەوە، بە نایاسایی، دەمگوازتەوە بە قاچاخ و نهێنی بۆ هەناوی سیستەمێك بە هیوای ئەوەی ببمە هاولاتی و مرۆڤ لە پانتاییەکی تردا لە ژێر سیستەمێکی تردا. من نەمدەویست ببم بە کەسێکی تر، سەردارێکی تر، ئەوەی دەمویست ببم بە خۆم. ڕێگەم بدرێت خۆم بم. بڤەترین شتە خۆت بیت لە رۆژهەلات. وەك نایاساییەك کە گەشتین دەبێ ئاگامان لە خۆمان بێت، زۆر لە کەسەکان و شتەکان نەڕوانین. بێدەنگ بە دوای ڕێبەرەکەماندا بڕۆین هەتا دەمانگەیەنێتە جێگایەکی سەلامەت. ئێمە دەبوو بشاردرێتەوە. نەدەبوو ببینرێین. مرۆڤێکی نەبیراو، نەك لە جۆری پاڵەوانی ڕۆمانەکەی، ڕۆماننوسی رەش پێستی ئەمریکی رالف ئیلسۆن، کە بەدەست نەبینراوێتیەکی ئەنقەستەوە دەناڵێنی لە میانەی سیستەمی ڕەگەزپەرستی ئەمریکیدا. ئێمە هیوامان وەها بوو نەبینرێین، هاوارمان نەدەکرد بۆ ئەوەی ببینرێین. سوپاسی ئەوانەمان دەکرد کە بە لاماندا تێدەپەڕین و نەیاندەبینین. حەزمان دەکرد وەك دێو، وەك دێوزەمە، وەك جنۆکە وابین. لەوێ بین و لەوێ نەبین. پاش ئۆتۆگار، کە گەراچی پاس بوو، بە کۆمەڵ بردیناین بۆ فاتیح. وەها باشترە بۆ کۆ قسەبکەم، چونکە من تەنها نەبووم چەندینی تری وەك من لە گەڵمدا بوون. مێگەل ئاسا ئەوانیش بێدەنگ، بێدەنگ سەری هەمان ڕێگایان دەگرت. بە ئاژەڵ بوون لە سەفەرێکی وەهادا ئاساییە. لە دەستدانی هەموو ئیرادەیەك، هەموو خواستێك، هەموو زانیاریەك هەموو تایبەتمەندیەك تەنها وەك ئاژەڵت پێدەکات. «دیارە لێرەدا هەست بە جۆرێك لە نارەحەتی دەکەم لەم بەراوردەدا، لە مێژووی بیری مرۆڤدا ئەم دیاردەی خۆ بەراوردکردنی مرۆڤ بە ئاژەڵ هەمیشە خۆ بە بالابینین، قەیرانێکی گەورەی هێناوەتە ئاراوە،

ئەمە کێشەیەکی فەلسەفی، ئەخلاقی، سیاسی، ئابورییە». دیارە وەك لە زۆر کۆمەڵگای تردا؛ بە ئاژەڵ بوون لە کۆمەڵگای کوردیدا بە سوکایەتی تەماشا دەکرێت. بەڵام کردنی مرۆڤ بە ئاژەڵ بەبێ ناولێنانی ئاساییە. یانی ئاژەڵ بوون بە کردەوە ئاساییە، ئاژەڵ بوون بە ناو بڤەیە. دەکرێت سیستەمێکی سیاسی لە ئاژەڵ کەمتر ماف بە رەعیەتەکەی بدات، بەڵام ناویان لێبنێت هاووڵاتی و هەموو دڵخۆش بن.

بوون لە گەرەکی فاتیح جۆرێك بوو لە رێکەوتێکی گاڵتە ئامێز. سوڵتان موحەمەد لە سەدەی پانزە ئەو شارەی فەتحکرد، وەك ئەدەبیاتی ئیسلامی فراوانخوازی وەها ناوی دەبات. ئێمە بە خشکەی هاتبووین بۆئەوەی کەس پێمان نەزانێت و تێپەرین. ئێمە ئامانجمان فەتح نەبوو. فەتحێك کە خەونمان بوو فەتحی خۆمان بوو بەرامبەر دونیا بەڵام لەوێندەرێ نا. لە جێگایەکی تر. ئەوێ تەنها سەرەتای کیشوەری خەونەکان بوو، سەرەتایەکی پڕ تەمومژە. ئیستەنبول بەشێکە و بەشێك نییە لە پرۆژەی خەونی چوونە رۆژئاوا. ئەوروپایە و ئەوروپا نییە. نەمانزانی ئەوە قەدەری شوناسی ئێمەیە بۆ هەمیشە. لە رۆژئاوابین و رۆژئاوایی نەبین، لە رۆژهەڵات بین و رۆژهەڵاتی نەبین. شوناسێکی شل لە ناوەنددا.

لە فاتیح تەپێنراینە شوقەیەك لە نهۆمی دوو. بەندیخانەیەکی ڕووناك بوو. زیاتر لە جێگای نهێنی خەڵکانێکی شۆرشگێر یان کودەتا پلان دەچوو. لە شوقەکە دوو ژووری بچکۆلە و هۆڵێکی باریکی درێژ و ژوورێکی پان و پۆر هەبوو. هەموو کەس لە هەموو جێگایەکدا دەنوست. هەرزوو وەك کۆمەڵگای سەرەتایی هەر برێك بوون بە کۆمەڵەیەك، لە سەر بنەمای ناسراوی، خەڵکی شارێك و گەڕەکێك و جێگایەك؛ ئیتر پێکەوە خەمی یەکتریان دەخوارد. خواردن دروستکردن تەنها چالاکی بوو. دیارە بێگومان پیساییکردنیش. پیساییکردن لە کەلتورێکەوە بۆ کەلتورێکی تر دەگۆرێت. لە شوقەکە تەوالێتی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی هەبوون. هەرچەندە هەموو بۆ رۆژئاوا ژیانیان خستبوە مەترسیەوە بەڵام کەم کەس تەوالێتی رۆژئاوایی بەکاردەهێنا. ناجۆربوو بە ئیسراحەت دابنیشیت و پیساییت لێبێتە دەرەوە. دیارە تەوالێتی رۆژئاوایی بۆ جۆری خواردنی رۆژهەڵاتی نابێت. بەتایبەتی بۆ ئێمە لەوێ کە نەمان ئەتوانی بجوڵێین و بەردەوام خواردنمان دەخوارد. بەڵام ئەمە کێشەکە نەبوو کێشەکە جۆرێکی تری ژیاربوو کە ئێمە شەرممان لێئەکرد. پێی ئاشنانەبووین، نەمان ئەزانی چۆن پێی ڕابێین. سەرنج ئامێزە کە چوون بۆ رۆژئاوا لە ئاودەستەوە دەست پێبکات. یان یەکەم ئامرازی







گەیشتن

ئاودەست بێت. لە یادم نییە کە ئەندازیاری تەوالێتەکان چۆن بوون. ئایا لە جۆری ئەڵمانی بوون کە دەتوانی هەموو پیساییەکە ببینی پێش ئەوەی بە ئاو رایماڵی؟ «وەك سلاڤیو ژیژاك لە زاری کەسێکی ترەوە دەڵێت، مایەی سەمەرە نییە کە ئەڵمانەکان توانییان کامپی قڕ کردنی خەڵکی بەڕێوەبەرن، هەرکەسێك هێندە لە پیسایی خۆی رامێنێ هەموو درندەییەکی لە دەست دێت». یان لە جۆری فەرەنسی کە پێویست ناکات پیساییەکە ببینی، یان ئینگلیزی کە تێکەڵەیەکە لە هەردوو؟؟ بەڵام ئەگەری زیاتر لە جۆری ئەڵمانی بووبێت چونکە تورك و ئەڵمانی بازرگانی زۆریان پێکەوە هەیە. چل ڕۆژ لەوێ نەماینەوە. لە ڕێگای شت و مەك و خۆراك و تەلەفزیون و دەنگی ژاوەژاوی شارەوە لە ئیستەنبول بووین. تەنانەت جارێکیش ڕێگەمان پێنەدرا سەرێ لە دەرەوە بکێشین. لەوێ کۆمەڵێ دەڵاڵ هەبوون. وەك پیاوی بەرپرس و سیاسی، هەمیشە باس مەزنی و گەورەیی قاچاخچیەکەیان دەکرد. باسی موعجیزەکانی سەفەر. باسی توانای رزگارکردن و رزگاربوون. «من خەڵکی هیچ گەلێکی ترم نەدیوە هێندەی کورد بە

شان و باڵی کەسێکدا هەڵدات کە لە ژێر کاریگەریدابێت». دەڵاڵەکان، لە قاچاخچیەکان کەمتربوون، لە ئێمە باڵاتر، ئەوان بۆیان هەبوو بچنە دەرەوە، هەمیشە بە خۆشیەکی زۆرەوە، سەربوردەی شاریان بۆ دەگێڕاینەوە. هەموو ئیرەییان پێدەبردن. چۆن ئێمە لە شارێك بووین و بۆمان نەبوو ببینین. ئیستەنبول بۆ ئێمە پانتاییەکی یاساخ بوو. لە شارێکی ئەفسانەیی دەچوو کە لە زاری خەڵکانێکەوە دەگێڕدرایەوە کە ئارەزویان دەچووە سەر ئافرەت و کاڵا. لەوێ هەموو شتێك باس دەکرا، سیاسەت، دەرچوون، پەرینەوە، یونان، ئەسینا، ئەوروپا، گەڕانەوە، پارە، دەوڵەمەندبوون، هێنان یان ڕاکێشانی کچی مناڵ، خەونی پڕ لە فیز. دوای چل ڕۆژ لە خۆرنشینی ئێوارەیەکدا ئەوێمان جێهێشت. پاش چەند ڕۆژێك هەموومان سنورداش کراین. سەفەرێك بوو بۆ تخوبەکانی ئەورپا.

# پەرەسیلکە لە لەندەن

کە فرۆکەکە گەیشتە فرۆکەخانەی گات ویك، وردە بارانێکی نەرم دەباری. چێشتەنگاو بوو، موسافیرەکە تەنها کۆڵەپشتێکی رەنگ نیلی پێبوو. هەرزوو فرۆکەکەی جێهێشت، پاش ئەوەی پۆلیسی فرۆکەخانەکە لە چاوەکانی روانی و پاشان لە سکرینی کۆمپیوتەرەکە بۆ داتاکانی گەڕا، ئیزنیدا بڕوات. گەر لە جێگایەکی باڵاوە تەماشای موسافیرەکە بکەی، بە سەر کۆڵەپشتەکەیەوە هێمای پەرەسیلکەیەك دەبینی: کە بە دەزوو لە سەر بەشی سەرەوەی کۆڵەپشتەکەی چنراوە. موسافیرەکە پاشان لە ئامێری بلیت فرۆشەکە بلیتێك دەکرێت بۆ ناو لەندەن، لاوێکی هیندی ڕەنگ پێی دەڵێت: دەبێت بچێت بۆ ویستگەی ڤیکتۆریا، ئینجا لەوێوە بۆ ئێجوارد رۆد، هەتا بگەیێتە ئەو قاوەخانەیەی کە ناوەکەی ئیسپانیە.



موسافیرەکە، هەرچەندە کۆڵەپشتەکەی کۆن بوو، بەڵام تەنها لە میوانخانەی بێدفۆرد لە ناوەراستی لەندەن، لە ئێوارەیەکی درەنگدا، پاش نان خوارد لە چێشتخانەیەکی ئیتاڵی کاتێك بە ماندوویی گەرایەوە ژوورەکە، چاوی کەوتە سەر هێمای پەرەسیلکەکە. هێماکە گەرچی لای ئەو روون بوو کە چی دەگەیەنێت، دەخوازێت چ هەستێك بوروژێنێت، بۆچی کۆمپانیایەکیی وێنەی باڵندەیەکی وەها بەکار دەبات، بەڵام لە راستیدا هیچ کام لەمانە بەلایەوە گرنگ نەبوو.

بیریکردوەوە کە پەرسێلکە باڵندەیەکی ئاسمان نشینە، وەك جارێکیان کوڕە شەش ساڵانەکەی پێی وت، تەنها بۆ زاوزێ دێتە سەر





زەوی. لەپڕ هەستی کرد
کە یادەوەرییەکی زۆر زۆری هەیە لە گەڵ باڵندەی پەرسیلکەدا. هەرچەندە هەوڵیدا لە نێوان یادەوەریەکانی و هێمای بازرگانیەکەی کۆمپانیەکەدا تێکەڵی نەکات، بەڵام کاتێ کە لە بانوێکەدا پاڵکەوت بۆئەوەی بحەسێتەوە، هەستیکرد کە تێکەڵەیەك لە یادەوەریدا ڕوودەدات. ژیانی خۆی و خوێندنی و ژیانی خێزانی و دەقە ئەدەبیەکانی هەموو تێکەڵ بەیەك دەبن.
ئەو ڕۆژە کە گەیشتە لەندەن ساردبوو. کاتێك لە فرۆکەخانە بەرەوە شار بەرێکەوت؛ بە تەنها لە فارگۆنەکەدا دانیشت و لە دەرەوەی دەڕوانی. ئاسمان دڵتەنگ بوو. هەورەکە جوانی سروشتەکەشی کاڵکردبوەوە. هەستی کرد کە ئەندازیاریی شارەکە جگە لە ژەنگ و خشتی سور کە ماندوبوونێکی زۆری پێوە دیاربوو، هیچی تر نەبوو. لەندەن لەو دەروازەیەوە بە هیچ شێوەیەك لە ناوەندی دونیا نەدەچوو، لە پایتەختێکی ئیمپراتۆری نەدەچوو. شەمەندەفەرەکە وەك مار هەتا دەهات لە هەناوی شار نزیك دەبوەوە، لە پردی ژەنگ گرتوو دەپەریەوە. ناوە ناوە دوکەڵی ئاگردانی ماڵەکان دەبنیران لە لولەی ئاگردانەکەیانەوە بەرەو ئاسمانە خۆڵەمێشیەکە لولی دەخوارد. ویستگەی ڤیکتۆریا بەلای موسافیرەکەوە ناوێکی ناخۆشی هەبوو. کە گەشتن سەرەتا نوتەك تاریك بوو. پاشان کە ڕۆشتە دەرەوە بایەکی سارد پێی وت کە ئەو لە وڵاتی ئینگلیزانە. موسافیرەکە ئینگلیزان بوو. دڵخۆش بوو بەوەی کە لە دووانی هەموان تێدەگات. ئەو لە وڵاتێکی ئەڵمانی زمانەوە لە بنار چیاکانی ئەلپەوە سەفەری کردبوو. هەرزوو ڕۆژنامەیەکی گاردیانی کڕی. وورد ووردە لە هەموو جێگایەك رادەما. پاشان لە ئافرەتێکی ئێجگار قەڵەوی پرسی کە چۆن بگاتە ویستگەی ئێدجوارد رۆد. ئافرەتە ئێجگار قەڵەوەکە دڵخۆش بوو کە پیاوێکی گەنم ڕەنگ پرسیاری لێدەکات، بە ووردی و بە حەوسەڵەیەکی کۆیلانەوە وەڵامی دایەوە. جارێکی تر موسافیرەکە چووەوە ژێر زەمینەکەوە. لەوێ چەند جارێکی تر پرسی، هەتا شەمەندەفەری ئێدجوارد رۆدی دۆزیەوە. ڕۆشتن

بە ناخی زەویدا، بە تاریکیدا، لە گەڵ ئاپۆرەیەکی زۆر لە خەڵك، جارناجارێك سەرەتاکێی ڕووناکی هەموو دیمەنی خۆشی بەخش بوون بە موسافیرەکە. موسافیرەکە ئەو شەوە لە لەندەن دەمایەوە، سبەینێ سەفەری دەکرد بۆ ئۆکسفۆرد.
کاتێك لە سەر کورسیە نەرمە پڕ ڕەنگەکان دانیشت، بیریکردەوە کە خۆش نییە لە شارێکی گەورەدا بژیت. پاش ساتێك بیری گۆڕی ڕەنگە زوو ڕابێیت. یان ڕەنگە سەرتاپای ژیانێکی تربێت. شاری گەورە هەمیشە دەرکەوتەیەکی کەرنەڤاڵی هەیە. دەرکەوتەیەك کە مرۆڤ دەوڵەمەندتر دەکات لە دید و چێژ و زەوق و ئاگاییەوە. دەرکەوتەیەك کە ڕێگە نادات خۆت بە تەنها بە بیرێکی بچکۆلەوە سەغڵەت کەیت و وەها بزانی کە ڕاستی. پیاوەکە دڵخۆش بوو کە ئەو ڕۆژە دەتوانێت بچێتە چەند کۆگایەکی کتێب فرۆشی دەستی دوو هەندێك کتێب بکرێت بۆ خۆی کوڕەکەی و ڕەنگە دانەیەکیش بۆ هاوسەرەکەی. کە شەو لە ئوتێلەکە کتێبە کڕیوەکانی دەرهێنا، لە نێویاندا تەنها کتێبێکی بۆ هاوسەرەکەی کڕیبوو ئەویش کتێبی نوسەری ئیتالی کلاودیو ماگریس بوو بە ناوی دانوب. ماگریس خەڵکی ترێستایە، ئەم کتێبەی سەفەرنامەیەکە بە ڕووباری دانوبدا. موسافیرەکە خۆشی چەند ساڵێك لەمەوپێش بە ڕووباری دانوبدا سەفەری کردبوو. جارێکیان کۆمەڵێك پیرە خانەنشینکراوی ئەڵمانی سەرخۆش، خەریك بوو بۆخۆشی فڕێی بدەنە ناو ڕووبارەکەوە. ئەو هێندە خۆشی لە چارەی ئەڵمان نایەت. موسافیرەکە کتێبەکەی ماگریسی لە کتێبخانەی واتەرستۆن کڕی لە پادێنگتۆن، پاش ئەوەی لە کۆڕەکەی خانەی بیری چاتام هاوس هاتە دەرەوە. زۆر کتێبی تری دی کە خواستی بیانکڕێت، بە تایبەت کتێبی کەمتر لە هیچ کە لە نوسینی سلاڤیو ژیژاك بوو.
موسافیرەکە کە لە وێنە بە دەزوو کێشراوەکەی سەر کۆڵەپشتەکەی ڕوانی، بیر لە دەقی وێرانە خاکی ئیلیوت کردەوە، لە یونانەکان، لە ماڵی بێ ئەندازە جوانی پەرەسیلکە لە بنمیچی دیوارەکانی گوندەکەیان لە گەرمیان. لە ڕووی ئەندازەییەوە ماڵی پەرەسیلکە دەگمەنە. هێلانەیەکی تۆکمەیە کە لە هێلانەی تر ناچێت. هێلانەی زۆربەی باڵندە لە پوش دروست دەکرێت، ماڵی پەرەسیلکە لە قوڕ. هێلانەی پەرەسیلکە جێگای خۆشەویستیە، پێکەوەبوون، هێلکە، بێچوو. بەڵام ماڵ نییە. جاستۆب باشلارد لە چاپتەری چواری کتێبی شیعریەتی پانتایی بە وردی باسی هەستی مرۆڤ دەکات لە پەیوەندی بە هێلانەوە. هێلانە هەستی مناڵی دەوروژێنێت. موسافیرەکە بە هەمان شێوە لە گەڵ پەرەسیلکەدا مناڵی یاد






دەهاتەوە. بەڵام هەروەها حیکاتی کتێبە پیرۆزەکان، چیرۆکی تەیروالئەبایلە. هەموو ئەمانە لەو ڕۆژەی لەندەن هەستێکی نامۆبوون. لە کافێخانەکەی ئێدجوارد رۆد موسافیرەکە لەگەڵ دوو هاوزمانی خۆیدا دانیشت باسی زۆر شتیان کرد، قاوەیان خواردەوە. پاشان بە جادەکەدا هاتنە خوارێ، بۆ یەکەم جار موسافیرەکە بە پێیانی خۆی لە هایدپارکدا ڕێیکرد. دیسانەوە مناڵی و مێردمنداڵی هاتەوە یاد؛ کاتێك لە ژێر جێگاوە گوێی لە رادیوی بی بی سی بەشی عەرەبی دەگرت، یان ئەو رۆژانەی کە لە کتێبخانە بچکۆلەکەی شارەکەیان ژمارەی کۆنی رۆژنامەی عەرەبی دەکرِی کە لەندەن دەردەچوو بۆ ئەوەی یارمەتی بدات کە لە پانتایی دژە ژیانی ئۆردوگا؛ فەنتازیایەکی بداتێ هەتا بگاتە جێگایەکی تری دوور. هەر ئەو رۆژە بەڵام بە هەستێکی جوداترەوە لە کۆگایەکی ڕۆژنامە فرۆش ڕۆژنامەی الحیاتی لەندەنی کڕی. دەیزانی کە پێویست ناکات بیخوێنێتەوە چونکە زۆربەی بابەتەکانی وەرگێردراوبوون یان لە ڕێگای میدیای ئەلکترۆنیەوە بەدەستی دەگەشت. بەڵام کڕینی ڕۆژنامەیەکی وەها کردەیەکی تایبەت بوو کە یارمەتی موسافیرەکەی ئەدا هەتا ساتێك لە یادەوەری مناڵی بژێتەوە. لە جێگاکەیدا لە ڕۆژنامەکەی ڕوانی، ڕۆژی دواتر لە خەو هەستا ڕۆژنامەکە لە تەنیشت سەرینەکەیەوە بوو. دیسانەوە ڕۆژێکی پڕ لە هەور بوو. خۆی ڕێکخست و چوو بۆ پیکادیللی هەتا بچێت بۆ ئۆکسفۆرد. ویستگەی پیکادیللی پان وپۆڕ بوو. لە دەروازەکەیدا کۆمەڵێك جگەرەیان دەکێشا. موسافیرەکە پێش ئەوەی بگاتە ویستگەکە دوا ژمارەی لەندەن رڤیو ئۆف بوکی کڕی، دوا رانانی تیادابوو دەربارەی ژیاننامە نوێیەکەی کارل مارکس. کە گەشتە ئۆکسفۆرد لە چێشتخانەیەکی پاکستانی ژەمێ نیمچە پاکی برنج و نوکی بە پێوە خوارد. پاشان بەرەو زانکۆ کەوتە ڕێ. هاتن لە لەندەنەوە بۆ ئۆکسفۆرد وەك هاتن بۆ لادێ وەهابوو. لە ئۆکسفۆرد ژیان زێدە خەواڵووبوو.

# ئیڤ ئینسلەر

## لە کیژۆڵەیەکی لاقەکراوەوە بۆ ئازادییخوازێك



لە ئینگلیزییەوە:

فاروق هۆمەر

خەونی من بۆ باشترین پیەسی شانۆیی ئەوەیە کە بتخاتە پێکەنین، شێتگیرت بکات، ئەوجا لە ناکاوێك فرێت بداتە نێو جەرگەی دۆزەخەوە و بە خۆت نەزانی چۆن گەیشتویتە ئەوێ. هەر لەبەرئەوەیە من کوشتەی گریکەکانم . ئەو شانۆییانە کۆمیدی نین، بەڵام بەبێ ئەوەی تۆ بتەوێت تێکەڵاوت دەبن و بەبێ ئەوەی بە خۆت بزانیت دڵ و گیانتیان ئارام و ئاسودە کردووە. بەلای منەوە، لەبەرئەوەیە ئێمە لە شانۆین، تەنیا شوێنێك کە بۆمان ماوەتەوە و تێیدا هەست بە بوونی خۆمان بکەین، شانۆیە . لە هیچ شوێنێکی دی ئەو هەستەت بەردەست ناکەوێت .

**ئیڤ ئینسلەر؛ نووسەر، مامۆستا، چالاکوانی سیاسی لە ساڵی ١٩٩٨ دا دەنگی خۆی دۆزییەوە . لە کاتێکا ئەو نووسەری دەیان پیەسی شانۆیی و پیەسی سینەماییە، لەوانە گەنجینە ١٩٨٧، ژنان ١٩٨٨، چارۆکە و پارچەکانی ١٩٩٢، گوشراوەی لیمۆ ١٩٩٣، دابەشککردنێکی بێئەندازە ١٩٩٤، رۆهادەی ژاکاو و بۆنهەڵمژ ١٩٩٥، ئامانجێکی پێویست ١٩٩٧، تاوانباربوون ١٩٩٩ .**

**ئیڤ:** من لە شاری نیویۆرك لە دایكبووم و لە كۆمەڵگایەكی زەنگین لە دەرەوەی شار گەورە بووم . خوشك و برام هەیە و سەرباری ئەوەی كە هەژار و دەستكورت نەبووین، هەتا خوا حەز بكات قۆناغێكی منداڵی ترسناكم گوزەراندووە . پڕ لە توندو تیژی، لێوانلێو لە بەد ڕەفتاری. گوزەرانێك لەناو شێتیدا. من لەناو كۆمەڵگایەكی ناسكدا گەورە بووم كە لە ڕواڵەتی دەرەوەی دا لە هەر كەسێكت دەڕوانی لە هیچی كەم نەبوو، بەڵام لە دیووی ناوەوەیدا لە لایەن باوكێكی نەخۆشی دڵبەردەوە وێران و وردو خاش دەكرام، باوكێك لە تەمەنی پێنج ساڵیمەوە تا بە دە ساڵیم دەگات لاقەی دەكردم و تا ئەو دەمەی لە تەمەنی شانزە ساڵیمدا ماڵەوەم بە جێهێشت، لە نێو ئەو درندەیی و بێرەحمیەدا درێژەم بە ژیانی خۆمدا. كە هاتمە دەرێ من هەم خاوەنی جەستەی خۆم نەبووم و هەم كەسێكی ئاسایی نەبووم و هەموو ژیانیشمی لێخواستم تا جارێكی دی بۆم بكرێت بە خۆمدا بێمەوە و سارێژ ببم و جەستەی خۆم بەدەست بهێنمەوە. بەڵام چی دی لە ژیانێكی كۆڵەواریدا نەمامەوە و لە شوێنێكدا نەبووم كە ژیانم لێ زەوت بكات. چەندین ساڵم بەو دەردەوە گوزەراند تا بۆم بلوێت درێژە بە بەرنامەكانی چارەسەر و سارێژبوونەوە بدەم و چی دی هەست بەو مۆتەكەیە نەكەم گیان و مەزاج و شێوازی بیركردنەوەمی لە دونیادا بە ڕووكار و كاریگەری خۆی بەبار هێنا بێت. ئەوەتام سەرگەرمی نووسینم، نووسین بۆ من بۆتە دەرونسازێك.

**گرین:** لە كەیەوە دەستت دایە نووسین؟

ئیڤ: من زۆر لە گەنجیمەوە دەستم دایە نووسین، پێموابێت لەو دەمەوە كە حەوت ساڵانبووم؛ وەك دەروازەیەك بۆ یادداشتكردنی ئەو بەشە لە دەروونی خۆم كە دەیخواست درێژە بە ژیانی خۆی بدات. وەك كلێشەسازی نەمدەنووسی، بەڵكو پێموابێت دەمنووسی بۆ ئەوەی نەمرم . پێموابێت بە خۆرسك لەوە دڵنیابووم ئەگەر بێتو لەناو وشەدا ئامادەییم هەبێت ئەوا بۆم دەكرێت لەناو گرفتیشدا بمێنمەوە. زۆر بەقووڵی هەستم بەوە دەكرد نەبینراوم، لەبەرئەوەی ببوومە كاڵایەك. خودێتیم یان بوونی خۆم وەك بابەتێك، هەر لە سەرەتای منداڵییەوە بنەبڕ كرا، نووسین



ئەو بوونەی بۆ گەڕانمەوە، نووسین وای کرد بِبمە بابەت و وەك منێك هەبم. نووسیم بۆ ئەوەی شێت نەبم. هەستم بەوە دەكرد زۆر بە قووڵی گوناهبار و گۆشەگیر کراوم. هەستم بەوە دەكرد ناپاکی لە دایکم دەکەم و تا سەر ئێسقان ڕقم لە خۆم دەبێتەوە. بێجگە لە نووسین شوێنێکی دی نەبوو ئەو دەربڕین و گوزارشتەی لێوە دەربڕم.

**گرین:** ئایا تۆ یادداشتت دەنوسییەوە؟

**ئیڤ:** بەڵێ.

**گرین:** لەکەیەوە تێکەڵ بە شانۆ بوویت؟

**ئیڤ:** من لە زانکۆ بووم، سەرقاڵی بەرهەمی باکۆس «یەکێکە لە دەقەکانی یۆربیدیس، و. کوردی» بووین، من ڕۆڵی ئاگۆییم دەبینی. لە یادمە تەختەی شانۆ خەریکبوو بە خوێن سوور هەڵدەگەڕا. زۆر ئاسودەی دەکردم. دواتر لە بەرهەمێکی سام شەپەرد دا کارم کرد بە ناوی شیکاغۆ، هەر هەموو ڕووداوەکان لە حەوزی گەرماوێکدا روویان دەدا. ئەو خاڵە منی زۆر دێوانە کردبوو، ڕێگەم بدە ئەوەت بۆ ڕوون بکەمەوە بۆ: من تا دوا ڕادە مەیزەدە و هیپی بووم. «هیپی، جوڵانەوەیەکی گەنجانە بوو لە شەست و هەفتاکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دا دامەزرا و زیاتر دژ بە بەها سواوەکانی سەرمایەداری دەوەستانەوە و دواتر وەك دیاردەیەك هەموو وڵاتانی ڕۆژئاوای گرتەوە. ئەم دیاردەیە لە نێو قوتابیانی زانکۆکاندا سەری هەڵدا و بانگەوازی ئازادی و یەکسانی و خۆشەویستیان دەکرد، و. کوردی».

بەڕێوەبەرێتی بەشی شانۆ سەرگەرمی بەرهەمێکی زۆرنتۆن وایڵدەر بوون بە ناوی شارەکەمان، کە دەقی تارمەی ژان ژینییە وەك دەقێکی تێکەڵکێش کەڵکی لێوەرگیرا بوو بۆ بەرهەمەکە. بە هەر هۆیەك، کە وابزانم هەر لەبەر ئەوەی من پرسیارێکم ئاراستەی کرد، وەك یاریدەدەری دەرهێنەر دیاریی کرام. لە ڕێی ئەو بەرهەمەوە شارەزاییەکی زۆرم لە شانۆ پەیدا کرد، ئەو دەقە هەڵگری پەیام بوو، دەقێکی ڕامیاری بوو و پڕ لە مانا گرنگ و قووڵەکانی ڕەوشت و مۆڕاڵ بوو . ئاشنا بوون بە شانۆ بەو شێوازە سەرنجراکێشە کاری تێکردم و کاریگەرییەکانی لەگەڵمدا مانەوە. دەزانم

ئەوەیان دەبێتە جێی بەزەیی، بەڵام یەکێکی دی لەو شانۆییانەی کە کاریگەری گەورەی لەسەرم هەبوو، ئەو کاتەی کە منداڵبووم دایکم بردمی بۆ بینینی شانۆیی مۆسیکاڵی ئۆلیڤەر! ئیدی لەوێوە تەواوێك ئاشنا بووم بە منداڵانی هەژار «منداڵانی لانەوازی بێ دایك و باوك» بە درێژایی ڕێی گەڕانەوە من هەر گریاوم و هەنسکم بۆ هەڵڕشتوون. دایکم نەیدەزانی چیم لەگەڵ بکات، بەڵام من لە یادمە بیرم لەوە دەکردەوە کە چەندێك جێی سەرسامییە بتوانیت لەسەر تەختەی شانۆ شتهایەك بڵێیت و گۆرانی بچڕیت و خەڵکان بهەژێنیت.

**گرین:** شانۆ لە زانکۆکەی تۆ دا خوێندنی سەرەکی بوو؟

**ئیڤ:** لە ڕاستیا نەخێر، هەر لە دوای بەرهەمی شارەکەمان ئیدی من هەموو سەرنجی خۆم هاویشتە سەر شانۆ . من گرفتار بوو بووم . من شەیدای بوو بووم . شانۆ تاکە شوێنێك بوو کە من تا ئەو کاتە هەستم بە دڵنیایی تیا کرد بێت. پێموایە بۆ یەکەمجار بوو ئەو دونیا و ژینگەیەم بە بەشێك لە خێزانی ڕاستەقینەی خۆم زانیبێت. ئیستاشی پێوە بێت هەر وا هەستدەکەم. هەر بەدوای تەواو بوونی زانکۆدا ئیدی ونبووم. هەر بەدوای نەمانی پەیکەری قوتابخانە و خوێندندا ئیدی هیچ سەرچاوەیەکی دارایی و پشتگیرییم شك پێنەدەبرد. بۆ ماوەیەك ڕۆژگارێکی زۆر سەخت و بێمانام تێپەڕاند. بوومە مەیزەدە و بەنگکێش. بە هەموو ماناکانی ووشە خزامە نێو خراپترین و بێزراوترین شوێنەوە و لە ڕووی سۆزدارییەوە ئیدی لە مردوویەك زیاتر چی دی نەبووم. هەر ئەوەندەی ڕێگەی خۆمم بەرەو دڵنیایی و هوشیاری دۆزییەوە ئیدی ئارەزووم بوو دەست بکەم بە شانۆ. هاتمە نیویۆرك، سەرباری ئەو هەقیقەتەی کە ژیانم شێواو بوو، ئەو فەنتازیایەم لە مێشکا بوو کە دەست بدەمە کاری دەرهێنان. باشە، هیچم بۆ پەیدا نەدەبوو کاری دەرهێنانی بۆ ئەنجام بدەم، بەڵام من دەمنووسی، لە نووسین ڕانەوەستابووم . شانۆگەرییەکی شیعرئامێزم نووسی کە یەکەم شانۆیی بوو بینوسم و تا ئیستاش نازانم لە کوێیە. دەربارەی شێتی و خۆ کوشتن بوو و من دڵنیام لەوەی کە زۆر ترسناکبوو. بەڵام خەڵکان لە هاندام نەدەوەستان. ددانم بە خۆمدا گرت و بە درێژاییساڵانێك هیچی ئەوتۆم تێدا نەکرد تەنیا ئەوەندە نەبێت کە شیعرم تیانووسی و زیندوو مام. وەك بەردەستێك لە بارِ و چێشتخانەی



‹سەری شێر› کارم دەکرد، لەوێ نووسەرێکی گەورەم ناسی ناوی جۆ فلاهێرتی بوو. شەوێکیان جورئەتم دا بە خۆم و لێم پرسی ئایا دەکرێ شیعرەکانم بخوێنێتەوە. چەند هەفتە چاوەڕوانیم دەکرد، هەر ئەوەندە نەبوو بەدەم چاوەڕوانییەوە نەدەمردم . لە دواجاردا بانگی کردم و پێیگووتم «تۆ نووسەریت، تۆ بەدڵنیایی نووسەریت و دەتوانی درێژە بە نووسینی خۆت بدەیت» گەلێك هێڵی سووری پێشنیار و تێبینی خۆی لێرەو لەوێی شیعرەکان جێهێشتبوو . ‹› تۆ دەست داناگریت، بەو جۆرە مەچۆ ناو شیعرەوە. با لەناو شیعردا بە سروشتی ئەو دەستداگیرییە کاری خۆی بکات ‹›دواتر شانۆیی›› دەمێك دەنگەکانی خۆم بانگدەکەم››م نوسی شانۆییەکی یەك

پەردەیی ژنانەیە دەربارەی ژنێکە نۆ دەنگی جیاوازی هەیە و هەوڵدەدات یەك یەك بیاندوێنێت. ئەوەش لە سەروەختێکا نووسیم کە لە ڕووی سوزدارییەوە خەریکی ئەوە بووم ژیانی خۆم دابڕێژمەوە. لە نهۆمی سەرەوەی باڵەخانەیەك لە ناو شار نمایشم کرد و دواتر گواسترایەوە بۆ کۆمەڵەی ستۆدیوی شانۆ . کارێکی زۆر سەرکەوتوو نەبوو بەڵام ئەوەم بۆ ڕوونبۆوە کە من دەمەوێت بۆ شانۆ بنووسم. دواتر شانۆیی ‹› لە هیچەوە هاتوو ‹›م نووسی.

**گرین:** ئەوە دەربارەی ژنێکە کە بۆ ماوەیەك دەبێتە منداڵێك و لە ڕێی گەڕانەوەی دەرونییەوە بەرەو منداڵی خۆی، بەرەو ئەو ئەزمووونە ترسناك و پڕ لە ئەشکەنجەییەی جارانی خۆی دەگەڕێتەوە.
ئیڤ: بۆمنەکرا تەواوی بکەم، لەبەرئەوەی لەڕاستیا هەموو ئەو یادەوەرییانەی خۆمم نەدەهاتنەوە یاد کە لە منداڵیمەوە تاکو ساڵی ١٩٩٠ چی ڕوویان داوە . هەموو شانۆییەکە دەربارەی ژنێك بوو کە ئەو هەموو ڕووداوە پڕ لە مەینەتبارییانەی خۆی ژیاوە کە من بۆمنەدەکرا دەستم پێیان ڕا بگات. بەڵام شانۆییەکە هەم سەرنجێکی زۆری ڕاکێشا و هەم ئەزمونێکی گەورەش بوو بۆ من. چونکە ئەوەی لێوە فێربووم کە چۆن بنووسم و جارێکی دی بنووسمەوە و ئازار بچێژم . ئای خودایە تۆ بڵێی من ئازارم چەشتبێت. سێ ساڵ هەوڵم دا ئەو شانۆییە لەسەر پێی خۆی ڕابوەستێت .
نەمئەزانی لە کوێ ‹›ئێ، دە بچۆ شانۆییەکی دی بنوسە‹› ئەوە منداڵەکەم بوو. ئەوە ژیانم بوو، بۆم

نەدەکرا لەسەر هیچ شتێکی تر هەدا بدەم. ئەو شانۆییە هەرگیز تەواو نەبوو . کوڕەکەم، دیلان ماکدێرمت ئەو منداڵەی کە هەڵمگرتبۆوە ئەو کات لە خوێندنگەی ساندی میزنەرس لە پۆلی نواندنی جان ودوارد بوو. «جوان، ژنە ئەکتەرێکی ئەمەریکی بەناوبانگە، بەرهەمهێنەرێکی شانۆ و سینەما بووە . ساڵی ١٩٥٧ لە فلیمی ‹‹سێ ڕوخساری حەوا›› دا پاداشتی ئۆسکاری وەرگرتووە. جوان لەگەڵ گەورە ئەکتەر و دەرهێنەری سینەما، پۆل نیومان دا پەیوەندی خێزانی پێکەوە دەنێ و پەیوەندییەکەیان، بە یەکێك لە درێژترین پەیوەندییەکانی هۆلیوود دادەنرێت، و . کوردی».



دیلان دەقێکی ‹‹لە هیچەوە هاتوو››ی بۆ بردبوو . من زۆر چالاکبووم و لە جوڵانەوەی دژە جەنگی ئەتۆم زۆربەی کاتەکانی خۆمم لەسەر شەقام بەسەر دەبرد و خۆم نووساندبوو بە ستوونی شەقامەکانەوە و بڵاوکراوە و ڕاگەیاندنەکانم دەبەخشییەوە بۆ ئەوەی جەنگی ئەتۆمی ڕابوەستێت.

من تەواو سەرقاڵی ئەوە بووم و هەموو وزە و توانای خۆمم پێبەخشیبوو. جوانیش کەسێکی چالاکبوو لە جوڵانەوەی دژە جەنگی ئەتۆم. کە بۆ یەکەم جار بە دیداری گەیشتم چرکەساتێکی پڕ لە جورئەت دای گرتبووم و نەمئەزانی ئەو هەستە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە و کاتێك پێم گووت ‹‹من دەبێت پیەسێکی شانۆییت بۆ بنووسم›› پێمگووت ‹‹من بە ڕاستی دەمەوێت لە هەڵمەتی ژنان بۆ ئاشتی شانۆییەك پێشکەش بکەین، چی دەبێت ئەگەر من دەقێکی شانۆییت بۆ بنووسم و لەو هەڵمەتەدا ژنان ڕۆڵی تیا بگێڕن؟››. ئەو پێیگووتم بینووسە. ئەوە بۆ من چرکەساتێکی تەواو ترسناك بوو. لەو کاتەدا، لەو هەڵمەتی ئاشتیەدا لە باخچەیەکی شاری نیویۆرك سەرقاڵی مانگرتبووم و دەستم کردبوو بە چاوپێکەوتن لەگەڵ خەڵکیدا. لە هەناوی ئەو جوڵانەوەیەوە شانۆی گەنجینە لە دایك بوو. یەکەم ڕەشنووسی بەرهەمەکەم پێدا.

ئەو پێیگووتم ‹‹دەمەوێت ئەوە بزانیت کە پیەسە شانۆییەکە باشە. بەڵام من دەمەوێت کۆمیدی بێت›› ئەوە خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە ژیانمدا . لەبەرئەوەی هەرگیز ئەو پێشهاتەم نەخستبووە بەردەم خۆم کە بۆت بکرێ سیاسەت بکەیتە کۆمیدی.

من زۆر پەرۆش بووم و شتەکانم بە توندی گرتبوو. ئەو کاتە گەنج بووم و تەمەنم هەر بیست و حەوت ساڵێك دەبوو. چوومە ماڵێ و جارێکی دی

دەستم کردەوە بە نووسینی شانۆییەکە تا وایلێهات تەواو کۆمیدی بێت. بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك کارمان تیای کرد. دوای ئەوەی چ لە لایەن جوان و کەسانێکی دییەوە هەندێك گۆرانگاری تیا کرا، جوان پێیوابوو شانۆییەکە ئیستا ئامادەیە بۆ کار کردن و ئیدی بڕیاری دا کە کاری دەرهێنانی بۆ بکات. داوامان لە شێرلی نایت «شێرلی، یەکێکە لە خانمە ئەکتەرە پڕ بەرهەمەکانی هۆلیوود و ئەندامێکی کارای گروپی ستۆدیوی ئەکتەر بووە، و. کوردی» کرد کە ڕۆڵی تیا بگێڕێت . تەواو ئەو ڕۆژگارە بوو کە جولانەوەی دژە جەنگی ئەتۆمی بوو. چووین بۆ خوێندنگەی سەربازی، ناوچەی تاقیگەی نیڤادا و ناوەندی کەنەدی تا بۆ کۆنگرێسی نمایش بکەین. ئیدی لەو قۆناغەدا من تەواوێك بەسەر ئەوەدا زاڵببووم کە چۆن ببمە نوسەرێکی شانۆیی.

**گرین:** ئەو قۆناغە سەرەتاییە لە شانۆ نووسین تا کوێ دێت؟
**ئیڤ:** تا شانۆیی ژنان . لە نێوان گەنجینە و ژنان شانۆییەکی دی هەیە بە ناوی پشیلە، پارچەیەکی ئەزموونگەری تەکنیکی شێتگیرە کە سەرباری ئەوەی رەخنەگران زۆریان ڕق لێی بووەوە، زۆر باش دەرچوو. هێرشێکی کوێرانەی بەدوادا هات. کلایف بارنز زۆر ڕقی لێی بۆوە. نوسینێکی لەسەر نووسی لەوێدا گوتبووی ‹‹پشیلەکە، سەگە›› من هەرگیز ئەوەم لە بیر ناچێتەوە. هەر ئەو شەوەی ئەو خوێدنەوەیە لە ڕۆژنامە دەرچوو بوو، باوکیشم بە دوایدا مرد . ئەوە یەکێك بوو لە ڕووداوەکان ‹‹بێگومان، لەوە زیاتر چی ڕوو دەدات؟›› شتگەلێك. بەڵام هەر کەسێك دەبێت خوێندنەوەیەکی خراپی بێتە ڕێ، ئەوە باشترین شتێکە کە بێتە ڕێت.

**گرین:** بۆچی؟
ئیڤ: لەبەرئەوەی ئەگەر بتوانیت ئەوە تێپەڕێنیت، چی دی بۆ هۆکارگەلێکی تەندروست دەنووسیت. تۆ دەنووسیت چونکە شتێکت هەیە دەتەوێت بیڵێیت. لەبەرئەوەی هەڵکردنێکی ترسناکە بۆیە ئاوا بە خراپی دەخوێندرێیتەوە، هەروەها ئەوەیە بمریت یان ببیتە نووسەر.

**گرین:** لە شانۆیی ژنان دا، هەر کارەکتەرێك وەك ئەوە دەکەوێتە ڕوو کە خەونێك یان فەنتازیایەك بێت، تۆ بۆ خۆت ئەوەت دەوێ کە

پیەسەکە وەك فەنتازیایەك بکەوێتە ڕوو؟
**ئیڤ:** من وەك خۆبەخشێك لە لانەی بێجێ و ڕێکان کارم دەکرد، بە خۆمم گوت دەبێت دەربارەی ژنێکی بێ ماڵ و حاڵ کارێك بەرهەم بهێنم. ڕێکەوتی گروپێکی موسیکاڵی شانۆییم کرد و دەرهێنەری هونەری گروپەکەم ناسی کە ناوی لین ئۆستن بوو. لین پێشنیاری ئەوەی پێکردم کە شانۆییەك بنوسم. بێگومان کارێك بێت لەوەوبەر هیچ گروپێکی مۆسیقاڵی شانۆیی ئەندێشەی کارێکی وەهای نەکرد بێت. لین ئەو بەختەی پێدام کە من بەو کارە هەستم. ئەوە بوو پیەسی ژنانم نووسی، بەڵام ئەگەر چی هێشتا لە ڕووی بونیادی شانۆییەوە ئەو توانایەم پەیدا نەکرد بوو کە پیەسێك بنووسم. لەبەرئەوەی ئارەزووم بوو لە ناخودئاگاییمدا درێژە بە ژیانم بدەم. من نەمدەویست گەشە بەو بەشەی تری مێشکم بدەم. من هەڵوەدای ئەوە بووم لەناو ئەو جێگا ناخودئاگاییە شاعیرانەیەدا بمێنمەوە کە شتەکان بۆ خۆیان تێکەڵاوی یەك دەبون و ڕێگای خۆیان بەرەو دەرەوە دەگرتە بەر. من تاسەر ئێسقان ڕقم لە بونیاد دەبۆوە، لەبەرئەوەی بە لای منەوە نوێنەری هەموو دونیای کاپیتاڵست بوو.
لە ئەنجامدا، شانۆییەکە وەك پارچەیەك شیعری درێژ هات بە دەستەوە کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر خەڵك جێهێشت و بۆ چەندین ساڵ نمایش کرا و لە ڕێی ئەو شانۆییەوە توانیم سەدان هەزار دۆلار بۆ ژنانی بێ ماڵو جێ پەیدا بکەم. بەڵام ئەو شانۆییە منی تێر نەدەکرد. من دەمویست شانۆییەك دەربارەی شەش کارەکتەری جیاواز بنووسم کە یەك چیرۆك هەر هەموویان پێکەوە کۆ بکاتەوە. نەمدەزانی چۆن ئەو کارە بکەم، من زۆر لەوە سەرکەشتر بووم خۆم بدەم بە دەست بونیادەوە. بونیاد وەك باوکم وابوو. بە شێوازێك هاتم و هەردووکیانم هاوتا کرد بە یەکدی. بونیاد بەخشین بە شتەکان وەك ئەوە بوو ڕێگە بدەم دەنگی بێتە ناو بەرهەمەکەمەوە و دەست و پەنجەمی لەگەڵ نەرم بکەم. بەو شێوەیە من لە نێو دونیای خۆمدا دەمامەوە، دونیای پانتایی و دوراییە چاوەڕواننەکراوەکان، دونیای ئەویش دونیای کۆنترۆڵکردن بوو.

**گرین:** تۆ چاوپێکەوتنت لەگەڵ ئەو ژنە بێ ماڵ و حاڵانەدا دەکرد کە کارت لەگەڵ دەکردن؟
ئیڤ: بەڵێ، بۆ ماوەی سێ ساڵ من چاوپێکەوتنم لەگەڵ دەکردن .

گرین: مۆنۆلۆگەکانیانت یادداشت دەکردن؟

**ئیڤ:** باشە، من لە ڕێی ئەوەوە فێربووم شێوازی نووسینی خۆم گەشە پێبدەم . سەرەتا چاوپێکەوتنم لەگەڵ دەکردن، دواجار ئەو چاوپێکەوتنانەم دەخوێندەوە و لەناو خۆمدا دەمپاڵاوتن و لەو پرۆسێسەوە، لێرە و لەوێ چەند دێرێکم لێهەڵدەبژاردن و لەگەڵیان دەدوام و لێیان ورد دەبوومەوە .

**گرین:** ئەو چاوپێکەوتنانەت تۆمار دەکرد؟

ئیڤ: نەخێر، بە هیچ جۆرێك تۆمارم نەدەکردن، تەنیا دەمنوسینەوە. لەبەرئەوەی دوای دانیشتن لەگەڵ ژنەکەدا، ئەوەم بۆ ڕوونبۆوە، ئەو چەند دێرە دەنووسم کە لام دەبێتە نیگەرانی. هەر کاتێکیش هاتە سەر مۆنۆلۆگ، با بڵێین دێرێکی لێوەردەگرم. بەڵام ئەو دێرە بزوێنەری مۆنۆلۆگەکەیە. بوونی ژنەکە لەوێیە، گەوهەری ئەو لەوێیە، بەڵام لەوانەیە وشەکانی لەوێ نەبێت. ڕەنگە دوو دەستەواژەی تیا بێت. لەگەڵ شانۆیی ژنان من گەشەم بە شێوازێك دا کە لەوەو دوا بۆ گەلێ کاری ترم بەکارم هێنا؛ لەوانە مۆنۆلۆگی کوز، ئامانجێکی پێویست، چەند فلیمێك، شانۆییەکی زیندان کە ئیستا بە دەستمەوەیە و کاری تێدا دەکەم. هەر کاتێك چاوپێکەوتنم لەگەڵ هەر ژنێکدا کردبێت لە لانەی ژنان، ئەوا بەرگێکم کردووە بەبەری ئەو پەیوەندییەدا کە لەگەڵیا دامەزراندووە. لەگەڵیا هاودەرد بووم و ئیستاشی پێوە بێت و دوای دە ساڵیش هەر هاودەرد ماوم لەگەڵی. بۆ نێو کۆی ئەو دونیایە کێشی کردووم .

**گرین:** بۆ نێو کۆمەڵگاکەی خۆی.

ئیڤ: کتومت؛ هەمان شت لەو بەرهەمەی بۆسنیەش ڕووی دایەوە، لە ئامانجێکی پێویست. لە بۆسنیە، ژنانی ئەوێ زۆر ئاسودەن کە تۆ لەوێ بە هانایانەوە چوویت و هاودەردیانیت؛ هەر کەسێك لە ئەمەریکاوە بە هانایانەوە بڕواتە ئەوێ ئەوان پێیان وایە موجیزەیە. من بڕیارم دا بگەمە ئەوێ، بگەمە ئەو ناوەندە، ناوەندی ئەو ژنانەی قوربانیانی جەنگن. لەوێ بۆ دوو هەفتە لەسەر قەنەفەیەك بمێنمەوە. بۆ مانگێك لەوێ مامەوە. من چووم لەوێ بمێنمەوە و لەوێ بژیم و ئەوانیش بەوەیان

زانی. ئەوە دەکەوێتە سەر ئەو ئاستەی کە تۆ چۆن تێکەڵ بە خەڵکان دەبیت. رەنگە ئەوە وا بکەوێتە ڕوو کە من باجی ئەو کارە بدەم بەڵام لە ڕاستیدا من هیچ باجێك نادەم، لەبەرئەوەی هەر کاتێك کە هەست بە هەقیقەت دەکەیت ئەوا تۆ ژیانی خۆت زۆر بە قووڵی ژیاویت. من ژیانی خۆم لە نێو ترسا ناگوزەرێنم. تەنیا شتێك کە لێیدەترسێم فرۆکەیە. تیا خەمبار دەبم و تیا دەگریم، من بە دووی کارەساتەکانەوەم و وانەیەکیش کە لەوەوە فێری بووم ئەوەیە ئەگەر بتەوێ لەگەڵی بژیت ئەوا لەگەڵیا بڕۆ. هەرگیز ناتکات بە هی خۆی، بەڵکو هەر کاتێك تۆ بترسیت و خۆتی لێ بە دوور بگریت و خۆت لە هەقیقەت نەبان بکەیت ئەوا ئەو لە خۆیت دەگرێت .

**گرین:** لەوە دەکات ئاسودە بیت لە کێڵگەی مۆنۆلۆگدا کار بکەیت؟
ئیڤ: من کوشتەی مۆنۆلۆگم. وا هەست دەکەم ئەوە شێوازێك بێت بۆ ئەوەی لێوەی بڕوانینە ژیانی ئەو کەسە. هەموو ژیانی منداڵی من مۆنۆلۆگ بوو.
من لە جیهانێکدا ژیام خەڵکان تێیدا لە پەیوەندیدا نەبوون، هەرگیز بەریەك نەکەوتن، هەرگیز مامەڵەیان لەگەڵ شتێکدا نەکرد کە کەسێکی دی دەورو پشتی خۆیانی تێیدا هاوبەشبن. من پێموایە مۆنۆلۆگ راسترین شێوازێك بێت. هەر جۆرێك بێت خەڵکان لە نێو مۆنۆلۆگدا دەژین. لە نێو هەقیقەتەکانی خۆیاند. مەبەستم ئەوەیە من دەمەوێت خەڵکان گفتوگۆیان هەبێت بەڵام وا هەستناکەم ئێمە هێشتا گەیشتبینە ئەو شوێنە. من پێموایە خەڵکان لەڕێی مۆنۆلۆگەوە پەیوەندی دەگرن. ریڵکە دەڵێت «ئێمە نیگابانی خەڵوەتەکانی یەکدین» پێموانییە وەها بێت ئێمە لە نێو پەیوەندیدا یەکانگیر بین. ئەوەی جێی سەرسامی منە ئەوەیە، ئێمە چۆن هەر هەمووومان پێکەوە لە نێو مۆنۆلۆگداین. بە هەمان شێوە هەمەرەنگییش؛ سەرسامم دەکات ئێمە چۆن هەر هەمووومان ڕەش و سپین پێکەوە، نەك چۆن هەر هەمووومان رەش سپین. ئێمە بوونمان وەهایە، نەوەك پەیوەندیمان وەهایە. ئەو سەرسامییەی من بۆ مۆنۆلۆگ هەمە ئەوەیە کە لەو ڕوانینە وردبینەوە ئێمە چۆن لەناو یەکدیدا بە نێومخەڵوەتی خۆماندا شۆڕدەبینەوە و هێشتاش یەکدیمان خۆشدەوێت؛ هەر تەواو پێچەوانەی ئەو بیرۆکە پێکەنینهێنەرەی کە ئێمە وەك منداڵ



پێی گۆشکراوین، ئەو شێوازەی تۆ لێوەی دەخزێیتە نێو خۆشەویستییەوە کە لەوێدا دەستبەرداری خۆت و کەسێتی خۆت بیت.

**گرین:** شێوازی نووسینی تۆ کتومت پشتی بە وشەسازی بەستووە، پێچەوانەی ئەوەی دونیای خۆی لەسەر بینین دابرێژێت؟

**ئیڤ:** ئەوە تەواوێکی گرفتەکەیە، وایە ؟ ئایا هیچ شتێکی دی بێ لە وشە گرفتە؟ وشە ژیانی منی پاراست. چۆن ووشەکان پێکەوە بلکێنیت و سۆزاوی و سەرنجوەر و شانۆواوی بڕسکێن، گوزارشت لە هەناو یاخوود لە ئارەزووبازی یان لە هەر شتێکی دی بکات.. هیچ شتێکی دی ئاسودە و خەنیم ناکات. من کەسێکم هەستی بینینم تیا ژیاو نییە. من کەسێکم بڕوام بەوە نییە کە دەیبینم. دونیایەك گێژاو و خەیاڵپلاویی هەیە و سەرتاپای ژیانی منیش پڕی بوو لە خەیاڵپلاوی. من باوکێکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێش، دایکێکی تا بڵێی شیرین، ماڵێکی خۆش، کۆمەڵگایەکی تا بڵێی ناسکم هەبوو، بەڵام هەر هەمووی درۆیەکی گەورە و زل بوون.

**گرین:** قۆناخی دووهەم لە شانۆ نووسین لە کەیەوە دەستپێدەکات؟

**ئیڤ:** پێموابیت لە چارۆکە و پارچەکانی، گوشراوەی لیمۆ، رۆهادەی ژاکاو و بۆنهەڵمژ؛ هەموو ئەوانە تازەن. ئەوانە سەرچاوەیان لە هەڤپەیڤینەوە وەرنەگرتووە. ئەوانە هەوڵدانی شانۆیین. هەوڵمداوە شێوازێك بدۆزمەوە بۆ ئەوەی دوو کەس پێکەوە لە هەمان ژووردا کۆ بکەمەوە، ئەگەر چی هەر یەکەشیان سەرقاڵی مۆنۆلۆگی خۆیان بن. هەروەها من درێژەم بە نووسینی ئەو بابەتانە داوە کە گرفتم لەگەڵیان هەبووە، وەك لاقەکردن و دەستدرێژی سێکسی. گوشراوەی لیمۆ، چوونە پێشەوەیەکی گەورە بوو بۆ من چونکە بۆمکرا لەوێدا ئەو دەنگە لە نێو خۆمدا بدۆزمەوە کە پچکێك بەدرەوشت و نزمە و چەند ساڵێك جارێ لە ناوەوەمدا سەر هەڵدەداتەوە. کێ دەزانێت ئەو دەنگە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت و دێتە دەرێ؟ هەروەها ئاسودە بووم کاتێ گوشراوەی لیمۆم نووسی، لەبەرئەوەی گەلێکم شارەزایی دەربارەی بونیاد پەیدا کرد. ئەوە جاری یەکەمم بوو خۆم دا بە دەستەوە و بەوپەڕی ئاگاییمەوە شانۆییەکم نووسی کە بونیادی لە خۆ گرتبێت.

**گرین:** لەوە دەچن هەوڵدانێك بن بۆ شێوازە ئەزمونگەرییەکان، گوشراوەی لیمۆ هێندێك بێهودەیی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە.
**ئیڤ:** گومانی تیدا نییە .

**گرین:** ئیلهامی لە کوێوە وەرگرتووە؟
**ئیڤ:** چیرۆکی کابرایەکە لە وێنجستەر، خێزانەکەی دەکوژێت و دیار نامێنێت. لەڕاستیا دوای نۆزدە ساڵ بۆیان دەردەکەوێت کە بکوژە. لەو قۆناغەدا کە دیاڕ نامێنێت، جارێکی دی ژن دەهێنێتەوە و خێزانێکی ئاسودە پێکدەهێنێت. ژنە تازەکەی دەڵێت هەرگیز بڕوا بەوە ناهێنێت، ئەگەر بێتو ئەوە ڕاست بێت کە مێردەکەی پیاوکوژە، ئەوا گومانی تیانییە کە تورەیان کردووە. گوشراوەی لیمۆ، بەلای خۆمەوە لەسەر دوو پێگە وەستاوە. وەك لایەنی کەسایەتی، قووڵبینییە لە بارەی خێزانەکەم. ڕەنگدانەوەی منداڵێتی خۆمە و پچکێك یادەوەری ئەوەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتوە، لە هەر کەسێك دەڕوانیت دەربارەی ئەوی دی بێئاگایە و هیچ شتێکی لەبارەوە نازانێت. وەك بیرۆکەیەك لە یادەوەریم ڕوانیوە. کەسانێك یاد کراونەتەوە و کەسانێك بە خۆیاندا چوونەتەوە کە دووچاری چی هاتوون. کەسانێك لە خۆیان دەڕواننەوە کە چیان کردووە. لە دەرەنجامی یادەوەرییەوە کەسانێك بۆیان دەردەکەوێت کە گەیشتونەتە کوێ. پێگەیەکی دی، وەك نووسەرێك هەستم بەوە کردووە بەرەو پێشەوە چووم و گەشەم کردووە . لە هەندێك جێگەدا هەندێك خاڵی لاوازیم جێهێشتوە و لە هەندێك جێگەی دی خاڵی پتەو و بەهێز زیادی کردووە. لە بارەی چیرۆکەکەوە بە ئاگابووم، لەوەوبەر بە هیچ جۆرێك هەستم بە چیرۆکێك نەکردووە کە سەرەتا و ناوەند و کۆتایی هەبێت. لە گوشراوەی لیمۆدا توانیومە مامەڵە لەگەڵ چیرۆکدا بکەم، ئەو بکوژە و بیرۆکەی یادەوەری هەردوکیان پێکەوە. ڕۆهادەی ژاکاویش، وەك پیەسێکی شانۆیی جارێکی دی هەنگاوێکی دییە بۆ من. هاوڕێیەکم سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشام کە بۆچی لەگەڵ خۆشەویستیدا مامەڵە ناکەم وەك تێگەیەك. منیش پێمگووت کە ئەوەم بەلاوە ئاسان نییە. ئەوە جێی ئاسودەییم بوو، ئەوپەڕی جێی هیوا بوو. ئەو بەرەنگارییە بۆ من

ساده نەبوو.

**گرین:** چارۆکە و پارچەکانیش بەهەمان شێوە دەرکەوتەی چیرۆکی خۆشەویستییە و کۆتاییەکی رۆمانتیکیشی لە خۆ گرتووە . ئەوە دەگۆڕێت.

ئیڤ: باشە، لەڕاستیا ئەوە ناگۆڕێت. هەر بۆ ئەو چرکەساتە دەگۆڕێت. گۆڕانێکی ئەوتۆ نییە کە بۆت بکرێ لە ئاستیا ڕابوەستیت. کاتێك چارۆکە و پارچەکانیم نووسی من تەواو گەشبین نەبووم. لەو بڕوایەدا نەبووم کە خەڵکان لە توانایاندا هەیە بگۆڕێن، خەڵکان بۆیان دەکرێ لەو شێوازە بێنە دەرێ کە دەقیان پێوە گرتووە. ئیستا بڕوام بەوە هەیە کە دەکرێ لەو شێوازە بێنە دەرێ. بەڵام ئەو هاتنە دەرەوەیەی چارۆکە و پارچەکانی لەو پەیوەندییە بەنگکێشییە تێکۆشانێکی گەورەی دەوێت.

**گرین:** لە هەڤپەیڤینێکتا لەگەڵ ولیەم هاریس بۆ نیویۆرك تایمز لەساڵی ١٩٨٩ دا دەڵێیت: « ژیانی من لە نێوان نووسین و لە نێوان ئەوەی چالاکوانێك بم دابەشبووە و هەوڵدەدەم ڕێگایەك بدۆزمەوە کە ئەو دوو دونیایە هەردوو پێکەوە بگونجێنم» ئەو لایەنەی دی وەك چالاکوانێك لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ کاتێك گوشراوەی لیمۆم خوێندەوە نیگەرانییەکم لا خوڵقا دەربارەی ئەوەی لە شوێنێکدا کە کچەکە دەڵێت: « دایکم باکی بە هیچ شتێك نەبوو، بۆیە دەبێت من گوێ بە هەموو شتێك بدەم» ئایا ئەوە خۆت نیت؟

ئیڤ: بێگومان، هەر نووسەرێك دەگریت ڕشتەی خۆی هەیە، هەر نووسەرێکیش کارەکتەرێکی هەیە کە لە هەموو بەرهەمێکیدا خۆی قووتدەکاتەوە. بەشێك لە ئەرکی نووسەر ئەوەیە نەك هەر بە تەنیا بەئاگابێت لەوەی ئەو شتانە لە کوێی نووسینەکەدا دەژین بەڵکو ئەوان لە کوێی تۆدان. من پێموایە هەمیشە بە جۆرێك لە جۆرەکان دەربارەی دایکم بنووسم. رەهام کرد و رەوانەی یەکێك لە کێڵگە ئازادەکانم کرد، ژیانێکی ئازادانەم پێبەخشییەوە. من ئەوم پاراست چونکە ئەو بۆی نەکرا من بپارێزێت. من بۆ جیهانێك تێدەکۆشم پڕی بێت لە دادوەری و کەمترین بوارێکی بۆ زەبروزەنگ تیا بمێنێتەوە. پەیداکردنی هاوسەنگییەك لە نێوان ئەوەی چالاکوانێك بم و لە نێوان ئەوەی بکشێمەوە بۆ نووسین، بۆ خۆی ئەشکەنجەیە. رەخسانی کات

بۆ خۆی جۆرێکە لە ئەشکەنجە. نووسینی گەنجینە، بۆ خۆی سەرەتایەك بوو؛ بۆم کرا دەربارەی گرفتێکی رامیاری پیەسێکی شانۆیی بنوسم و وەك دەروازەیەك بۆ گەشەسەندنی هوشیاری بەکاری بهێنم . لەگەڵ پیەسی ژنان، هەوڵم دا بۆ ئەوەی بزانم چۆن بۆم دەکرێ هەردوکیان پێکەوە کۆ بکەمەوە. کاتێك نەمایشی ژنان دەستی بە گەڕان کرد لێرە و لەوێ، هەم بۆ بەرزکردنەوەی هوشیاری بوو دەربارەی ژنانی بێلانە و هەم بۆ پەیداکردنی بژێوییەك بوو بۆیان. ئەو دوو هێزە لەنێو منا هەردوو پێکەوە یەکانگیر بوون و مۆنۆلۆگی کوز، پوختەی ئەو هەوڵە بوو. لەبەرئەوەی مۆنۆلۆگ بۆ خۆی هەڵقولاوی چیرۆکی هەقیقی ژنان بوو، ئەو ژنانەی بۆیان کرا رەنگپێدەرەوەی سیاسەت بن بەبێ هیچ ڕواڵەتگەرییەك. کاتێك ئەوەم ئەنجام دا، توانیم زەمینەیەك بۆ دامەزراندنی دایەلۆگێك لە نێو ژناندا برەخسێنم. بۆمکرا هەم ئەو تورەییە و هەم ئەو یەکبوونەش بجوڵێنم کە خۆی لە تێکشکانی ئەو دیوارەدا دەبینییەوە کە ژنانی دووچاری گۆشەگیری کردووە. لە تواناما بوو لەلایەك هونەر و لەلایەکی دی مەبەست، هاوشانی یەك دانێم.

**گرین:** من وای دەبینم واوەتر لە هەر شانۆنووسێکی ئەمەریکی چ پیاوان و چ ئافرەتان، تۆ پەیامی خۆتت هەیە.

**ئیڤ:** من بەرانبەر بەو پرسیارە هەمیشە شەرمێك دامدەگرێت. بە گەلێك شانۆنووس گەیشتوم کە پێیان وابووە هونەر بۆ خۆی ئامانجە. من بۆ خۆم وا بیرناکەمەوە. من هەڵگری پەیامێکم و بۆ ئەو پەیامە دەنووسم. من تێنسی ولیامز، سامۆئیل بیکێت، خاتوو کارێل چەرچڵ دێنمە بەرچاوی خۆم و دەپرسم ئایا ئەوانە خاوەنی پەیام بوون، بێگومان خاوەنی بوون.

**گرین:** ئایا هەندێك پەیام زیاتر لەوانی دی سیاسی تر ناکەونە بەرچاو؟

**ئیڤ :** وایە، پەیامی من هۆشیارکردنەوەیە. من ژنم، کاتێك کە دەنوسم تەواوێك هەست بەوە دەکەم. من سەبارەت بە هوشیاری خۆم دەربارەی جیهان دەنوسم. کاتێك دەڕۆم بۆ بۆسنیە و لە لانەی ژنانی بێ جێ و ڕێ دەمێنمەوە یاوەخوود سەردانی ئەو گرتووخانانەی ژنان دەکەم کە بە ئاسایشی لە ڕادەبەدەر تەنراون و ئەوەی لەوێ دەیبینم؛ تورەیی، نا دادوەری،

چەوسانەوە، توندوتیژی، تەمومژ و نا ڕۆشنی، زەبر و زەنگن. کەواتە حیلەکە لێرەدایە، چۆن دەربارەی هەموو ئەوانە دەنووسیت بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ بکێشی بەسەری کەسێکدا و هەوڵی ڕۆشنکردنەوە و فێرخوازی خۆشت بدەیت؟ لەلایەکی دییەوە، گرفتێکم ئەوەیە کە پێچەوانەی پەیام کار بکەم. دەبێ ڕێگەیەك پەیدا بکەم بۆ خوڵقاندنی. زۆر لە بەرهەمە بەراییەکانم پتر لە بەرهەمەکانی ئیستام، بە دووی بە مۆڕاڵکردنەوە بوون. لە جێیەکدا بەشێك لە ڕۆهادە من بۆ خۆم تووشی شۆك هاتم لەگەڵی کاتێ کە ڕێگەم دا کارەکتەرەکان شوێنی هەمدەردی بن وەك ئەوەی کە هەن. زۆر نییە لە سیناریۆی فلیمێك بوومەتەوە دەربارەی دوو پیاو، سەخترین کارێك بووە کە من تا ئیستا بە ئەنجامم گەیاند بێت. ئەو کارە دەربارەی ئەو دوو پیاوە هەشت ساڵی لێخواستم تا بیکەمە فلیمێکی سینەمایی، ئەو پانتایی و بایەخەی تێدا بدەم بە پیاو و وا بکەم هەردوکیان خۆشەویست بن.

**گرین:** لە پیەسی دابەشککردنێکی بێئەندازە، ئەوەی لەوێدا سەنتراڵە پیاوێکە بە ناوی پۆڵ ۆرکەر، دەرهێنەر و مامۆستایەکی نواندن کە خەڵکی نیویۆرکە و بە نەخۆشی ئایدز، گیان دەسپێرێت . تۆ لێرەدا لە شێوازی خۆت لات داوە . «پۆڵ، یەکێکە لە ئەکتەرە بەناوبانگەکانی هۆلیوود، و، کوردی».

**ئێڤ :** لە ڕاستیا ئەو شانۆییە دەرهاویشتەیەك بوو. کارێك بوو دەربارەی مردن، کە بە درێژایی هەموو ژیانم شوێن پێی هەڵگرتووم و داگیری کردووم لێرە و لەوێ لە نێو کارەکانمدا بەدەردەکەونەوە. دابەشکردنێکی بێئەندازە، بۆ یەکەمجار بوو مامەڵە لەگەڵ بۆچوونێکی وادا بکەم.

**گرین:** لەگەڵ پۆڵ ۆرکەردا خوێندت؟

**ئێڤ:** نەخێر، نەخێر، ئێمە دوو هاوڕێی نزیکی یەکدی بووین؛ ئەو پیەسی ژنانی بۆ شانۆ دەرهێنا و دەشبوو کاری دەرهێنان بۆ پیەسی گوشراوەی لیمۆ ئەنجام بدات. لەڕاستیا هێشتا تازە تووشی ئەو نەخۆشییە ببوو بۆ ماوەیەك لەگەڵ مندا ژیا.

**گرین:** کارەکتەرێکی تایبەتی خۆتت هەیە لە شانۆییەکدا؟

**ئێڤ:** شایەد لە هەموویدا .

**گرین:** ئایا مەبەستت بوە تاکە ئەکتەرێك هەموو ڕۆڵەکانت بۆ یاری بکات؟
**ئیڤ:** بەڵێ. کارێکی وام بۆ جەیمس لەیسن نووسیوەوە. ئەکتەرێکی سەرسوڕهێنەرە. من کاری دەرهێنانم لە پیەسێکی مۆنۆدرامی ئەودا کردووە بە ناوی ‹‹وشەی سەر زاری›› ئارەزوومە کارێکی دیشی لەگەڵدا بکەم.

**گرین:** پێتخۆشە کاری دەرهێنان ئەنجام بدەیت؟
ئیڤ: بەڵێ، کردوومە. بەڵام ئاسان نییە دەرهێنان بۆ کارێکی خۆت بکەیت. هەر بۆ نمونە من نامەوێت شانۆیی ئامانجە پێویستەکان دەربهێنم دەمەوێت کەسێکی دی بێت و ئەو کارە بگرێتە ئەستۆ. من زۆر نزیکم لێوەی، بۆ من زۆر ئازیزە. من لەگەڵیا نەرم دەبم، دەمەوێت کەسێکی دی بێت و کەمێك لەگەڵیا ڕەق بجوڵێتەوە.

**گرین:** پێتخۆشە جارێکی دی دەقێکی خۆت بنوسیتەوە؟
**ئیڤ:** زۆرم پێخۆشە. تۆنی مۆرسن دەربارەی چێژی نووسینەوە و خستنەوە سەر ڕەوتی دروستی خۆی دەدوێت، منیش لەگەڵی هاوڕام. ئەوە هەنگاوێکی مەزنە. دەستنووسی خۆتت هەیە، ماڵت هەیە و دەبێت سەرگەرمی ڕازاندنەوەی بیت. ماڵ بەشە سەختەکەیەتی، نووسینەوەش پرۆسەی ڕازاندنەوەکەیە.

**گرین:** لە دابەشککردنێکی بێئەندازە دا، ئەوە دەنووسی پۆڵ ۆرکەر، فێری کردویت هونەر تایبەتمەندییە. وا دەکەوێتە ڕوو کە ئەوە بەڵگەنەویستێك بێت، بەڵام وا دێتە پێش چاو کە یەکێك بێت لە گرنگەکان. هیچ شتێکت هەیە لەو بارەیەوە؟
**ئیڤ:** باشە، بۆ خۆت دەزانیت ئەوە جێی پێکەنینە؛ چەندێك بە نێو تەمەندا هەڵبکشێیت، ئەوەندە تایبەتمەندێتی دەدەیت بە خۆت. ئەو مەشقە وەك سەرەتایەك لە کۆرسی نووسین فێری قووتابیان دەکەم، لەو دەمەدا کە قوتابیان دەربارەی بیرەوەرییەکانی خۆیان سیناریۆیەك دەنووسن. ئەوجا هەموو ئەو هۆکارانەش دەنووسن کە بۆچی سیناریۆیەکیان هەڵبژاردووە

کە سەرچاوەی لە دەروونی کەسێتی منداڵی خۆیانەوە وەرگرتووە. چیان هەیە دەربارەی ئەوە بیڵێن؟ ئەفسوناوییە کە دەبینیت کێ زۆر تایبەتمەندە و کێش بە پێچەوانەوە. ئەوەی بە تەواوی تایبەتمەندی پێکا بێت ئەوە گەورەترین شانسی لەبەردەمدایە سیناریۆکەی بچێتە پێشەوە، لەبەرئەوەی ئیدی دونیایەکیان لەبەردەم خۆیاندا ئاوەڵا کردووە کە دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ داهاتوویان. دوو خاڵ سەرنجم تەواو ڕادەکێشن، هەر شتێك دەربارەی تایبەتمەندێتی بێت ئەوا لە کۆتاییدا زۆر سادە دەکەوێتە ڕوو. چیت هەیە بیڵێیت، لە ڕاستیا ئەو پارچەیە دەربارەی چییە؟ من وا ڕاهاتووم هەموو شتێك گەورە بکەم، لەبەرئەوەی بەرگەی قورسایی هەقیقەت ناگرم. من ناتوانم بەرگەی ئەو ئازارە بگرم کە لە هەقیقەتێکی سادەوە دەرژێتە دەرێ. لەبەرئەوە ڕاهاتووم لەسەرئەوەی هەر شتێك هەیە ئاڵۆز، فراوان، گەورەی بکەمەوە. نووسین دەربارەی ئەوەیە کە شتەکان ڕووتبکەیتەوە، لەوە نزیك بیتەوە کتومت لە نێو هەناوی خۆتا ڕوو دەدات. گومانی تیا نییە زۆرێکیشی شەرمهێنەرە.

**گرین:** مۆنۆلۆگی کوز و ئامانجە پێویستەکان هەردووکیان لە یەك سەردەمدا نووسراون.
**ئیڤ:** ئەو کاتەی کە دەستم بە نووسینی ئامانجە پێویستەکان کرد، ئەوەندە نەبوو لە تەواوکردنی یەکەم دەستنووسی مۆنۆلۆگی کوز ببوومەوە. دەستم بە نووسینی مۆنۆلۆگی کوز کرد و دواتر ساڵی ١٩٩٤ چووم بۆ بۆسنیە.

**گرین:** بۆچی ڕووتکردە بۆسنیە؟
**ئیڤ:** من بەرەو بۆسنیە چووم چونکە سەرگەرمی فلیمێك بووم. تا کار لە فلیمێکی یۆتۆپیایی دا بکەم کە بۆ خۆم نووسیبووم.

**گرین:** فلیمێکی یۆتۆبی؟
**ئیڤ:** بەڵێ، فلیمێکی یۆتۆبی فیمینیستی، لە سەرووەختی کۆرسێکی نووسینا ئەو بەرهەمەم لا خوڵقا. شانۆی جەماوەر ڕایسپاردم بۆ ئەنجامدانی ئەو بەرهەمە.

**گرین:** ئامانجە پێویستەکان و مۆنۆلۆگی کوز لەگەڵ بەرهەمەکانی لەوەوبەرتا زۆر جیاوازن. ڕشتەی «پیاو - ژن» جێدەهێڵێت و لەوە

دەڕوانیت کە چۆن ژنان وەڵام بە خۆیان دەدەنەوە.
**ئیڤ:** من چیتر قوربانییەك نیم. من چیتر لەگەڵ ئەو کاردانەوەیەدا ناژیم کە لە منداڵیمدا ڕووبەڕووم بۆتەوە. ئەو سەردەمەی ژیانم دەربارەی دۆزینەوەی ئەوەیە لە ناوەوەی مندا چی چەکەرە دەکات و پەی بەوە بەرم کە ئەو دەنگە هیوابەخشەی لە نێو مندایە بە چ شێوەیەك بەکاریبەرم. یەکێك لەو دیاردانە دەرکم بەوە کرد کە ئەو پەیوەندییەی ژنان بە جەستەی خۆیانەوە گرێدەداتەوە بەرەو پێشەوە بەرم. من زۆربەی ژیانم لەگەڵ جەستەی خۆمدا دابڕاوبووم و ئیستا چوومەتەوە ناوی، لەناو زۆربەی شتەکانی دیدا ئاگاییم لەسەر سنگ و کوزمە و دەمەوێت دەربارەیان بدوێم. خەڵکان دێن بۆ لام و پێمدەڵێن مۆنۆلۆگی کوز تایبەتمەندە، بە هیچ جۆرێك تایبەتمەند نییە. دەربارەی ژنانە. من هەزاران پیەسم دەربارەی پیاوان دیتوە و هیچ کەسێك نەهاتووە بڵێ تایبەتمەندە. تەنیا دەڵێن دەربارەی پیاوە. ئەی بۆچی نابێت پیەسێك هەبێت تەنیا دەربارەی ژن بێت؟

**گرین:** پیاو لە مۆنۆلۆگی کوزدا هەن، ئەوان لە بانگراوندان.
**ئیڤ:** بەڵێ، وایە. گەلێك ڕۆڵی سەرنجڕاکێشیان هەیە، لەم ماوەیەدا هەندێك مۆنۆلۆگی تازەم نوسیووە، لەبەرئەوەی پیاو حەز دەکات تەماشای بکات. دەربارەی ژنان، کە لەگەڵ پیاواندا وەك چێژبینێك لە کوز تێکهەڵکێشبوون و لە ئەنجامی ئەوەشەوە ژن کوزی خۆی خۆشدەوێت. من نەمتوانی ئەو بەشەی بنووسم تاوەکو لە هەڤپەیڤینەکانەوە گوێبیستی ئەوە بووم.

**گرین:** دەتوانیت پێم بڵێی لەدوای ئەوەی مۆنۆلۆگی کوزت بۆ یەکەمینجار لە قاوەخانەیەکی شەقامی کۆرنێلا نەمایشکرد لە ساڵی ١٩٩٦ دا و دواجار لێرەش لە ساڵی ١٩٩٧ دا. کەی ئەو بەشەت بۆ زیاد کرد کە دەربارەی منداڵبوونە. من لەو کاتەدا لە ژوورەکەدا بووم.
**ئیڤ:** لەو کاتەدا کە مۆنۆلۆگەکەم لێرە نەمایش دەکرد.

**گرین:** ئەی ئەو مۆنۆلۆگەی دەربارەی کوزی ـ دۆستی پیاو؟
ئیڤ: بۆ رۆژی ـ ڤی ساڵی ١٩٩٨ بوو.



**گرین:** هەروەها مۆنۆلۆگێکی دیت خستە پاڵی بە ناوی کوزی تورەی من، بۆ ڕۆژی ـ ڤی ساڵی ١٩٩٨. لە دەقە چاپکراوەکەدا مۆنۆلۆگێکی دی هەیە دەربارەی سوڕی مانگانەی ژن.

**ئیڤ:** بەڵام ئەوەم نمایش نەکرد.
گرین: هەستی تۆ چۆنە کاتێك کەسانێکی دی نمایشی مۆنۆلۆگی کوز دەکەن؟

**ئیڤ:** دەموروژێنێت، دوای ئەوەی کە لە نمایشەکە دێمە دەرێ. ئەوان هەر دوو هەفتە لە نێوان سێ ژنی جیاواز دا جێگۆرکێی پێدەکەن و منیش پێداچوونەوەم بە پیەسەکەدا کردووە و گێرانەوە شانە شانە بە دوای یەکدا دێ بە جۆرێك کە دەتوانن بەبێ حیکایەتخوان نمایشی بکەن. پێشەکییەکەیان لێدابڕاندووە. مۆنۆلۆگی کوز لە نێوان سێ ئەکتەردا تووشی دڵەڕاوکێی کردووم. هەروەها ۆرکشۆپێکم لەگەڵ سەد خوێنکاردا کردووە کە دێنە زانکۆی کۆلۆمپیا لە نیویۆرك. هەر یەکێکیان بەشێك بۆ زانکۆکەی خۆی دەردەهێنێت، لەبەرئەوە ڕۆژێك پێکەوە مەشقمان کرد و کارم لەسەر هەموو ئەو ترسانە کرد کە تێیاندا ڕووا بوو.

**گرین:** ئەو ترسانە چیبوون؟
ئیڤ: هەندێکیان لەوێوە سەرچاوەیان گرتووە کە بەرێوبەرایەتی هەندێك گرتنەوە و بڕین لە بەرنامەکانی ژنان دا ئەنجام دەدەن لە ترسی ئەوەی نەك بەرهەمەکان بە باشی بەڕێوە نەچن. بەڵام بڕوا بەو کارانە ناکەیت کە ئەو قوتابیانە لەو زانکۆیانەدا ئەنجامی دەدەن. وێنەی کوز دەکێشن و بەشەکانی شیدەکەنەوە و هەر ئەو وێنانەش دەکەنە بلیتی بەخێرهاتن و لێرە و لەوێ بڵاوی دەکەنەوە بۆ کۆکردنەوە و بانگکردنی بینەر. گەلێك بەرهەمی قوتابیان لەگەڵ لانەی ژنانی بێ جێو ڕێ، نەمایشکرا بۆ ئەو ژنانەی کە تووشی لێدان و زەبرو زەنگ بوونەتەوە. بەبەراورد بەو کارانە من بۆ خۆم لە ژیانمدا هەرگیز نەمتوانیوە کاری ئاوا جوان ئەنجام بدەم. کیژۆڵەی نێوان تەمەنی پانزە بۆ بیستویەك دەبینی کە تێکەڵاو بە دونیای ژنێتی خۆی دەبێت.

**گرین:** بۆچی پێتوایە ڕوولێنانێکی دڵخۆشکەر بەرانبەر بە مۆنۆلۆگی کوز لە

ئارادایە؟ گریمانەی ئەوەیە کە ئێمە لە ڕۆژگاری پاش فیمینیزماین؟
**ئیڤ:** لەبەرئەوەی بە دڵنیاییەوە ئێمە لە ڕۆژگاری پاش فیمینیزما نین. ئەوە درۆیەکی زۆر گەورەیە. ژنان لەم ڕۆژگارەی ئیستای خۆیاندا برسین بۆ ئازادی خۆیان. ژنان هەموو شەوێك دێن لەو نەمایشەدا دادەنیشن و دواجار دەڕۆنەوە ماڵێ. پێویستمان بەوەیە بێدەنگبین لە قسە کردن لەبارەی پاش فیمینیزمەوە. پێویستماڵن بەوەیە لەو تێرمە دوور بکەوینەوە. ژنان هەر لەگەڵ هەمان ئەو بارودۆخەدا دەستەوئێخەن کە لە ئارادایە و هەمیشە لە پێناویدا تێکۆشاون و زۆر بە قووڵتر لە جارانیش برسی ئازادین. بێ لەوە زیاتر  کە لە ناوجەرگەی چیرۆکە هەقیقییەکانی ژنانەوە سەرچاوەی گرتووە و ژنان خۆیانی تیا دەبینەوە و لەگەڵی بە وەڵام دێن، پەی بە شتێکی دی نابەم بۆچی مۆنۆلۆگی کوز بابەتێکی بزوێنەر بووە. کێ تا ئیستا لەبارەی مۆنۆلۆگەوە دوا بێت؟ هەست بەوە ناکەن کە دادوەری کرابن، بەڵکو هەست بەوە دەکەن کە لە نێو ئەندێشەی ژنێتیدا شوێنێك بۆ خۆیان دەدۆزنەوە. هێشتا ژیانی خۆتانە. بزوێنەری خۆتانە.

**گرین:** جێی سەرسورمانە کە مۆنۆلۆگی کوز بۆتە بەرهەمێکی بازرگانی شانۆی برۆدوای. شانۆی باو شوێنێکی شیاو نییە بۆ گەشتێکی لەو جۆرە.
**ئیڤ:** ئەرکی شانۆی سەرمایەداری ئەوەیە کە خۆڵ بکاتە چاوی جەماوەر و هەوڵی ڕامکردنیان بدات. بۆ ئەوە نییە کە ئیلهام بە جەماوەر ببەخشێت و تووڕەیان بکات. لەناو ئەو کلتورە پڕ لە گرفت و گێژاوەدا بە جۆرێك وەك هونەرمەند زیندوو دەمێنینەوە کە لە ڕەگوریشەوە هەوڵی گۆڕین  بدەین.

**گرین:** شانۆیەکی دژە قازانج هەیە، کە هەوڵنادات ببێتە شانۆیەکی سەرمایەداری.
**ئیڤ:** بەڵام ئەویش هەر بەو دەردە چووە، با خۆمان تەفرە نەدەین. هەر تێکەڵ بە هەمان ئاقار دەبێتەوە و دەستو پەنجەی لەگەڵ هەمان سیستەم تێکەڵ کردووە. من لەلایەن ئەوانیشەوە پاڵپشتی کراوم، بەڵام لەسەر ئاستێکی گشتی، کوا ئەو سەرچاوە هەقیقیانە بۆ خەڵکانێك کە دەیانەوێت پرسیار بکەن سەرگەرمی کار کردن بن؟ ئێمە لە ئەمەریکا

شانۆی تێکۆشانمان نییە. ئێمە شانۆیەکمان نییە بۆ پەیوەندی گرتن. شانۆییەکمان نییە کۆمەڵگا هەڵبسەنگێنێت. تۆ بۆت دەکرێ شتەکان بەبار بهێنیت و هەوڵدانێکت هەبێت بۆ ئەوەی ئەم ئەکتەر یان ئەو ئەکتەرت بەدەستبکەوێت، زۆربەی ئێمە کە کارمان کردووە، وامان کردوە و فێربووین کارەکان بەو جۆرە تێپەڕێنین. خۆی نابێت ئێمە بەو جۆرە کار بکەین، دەبێت خەڵکانێکت هەبێت ئەو کارانەت بۆ رێکبخات. ئێستا تۆ ئەگەر خانمە ئەکتەرێکی گەورەت بەدەستبکەوێت لە شانۆییەکەدا ڕۆڵبگێڕێت، خەڵکان کێشەکەتیان بەلاوە ئاسایی دەبێت. سەردەمانێك کە من چالاکوانێکی لاو بووم، ڕووت دەکردە سەر شەقام، بەیاننامەت بلاو دەکردەوە و خەڵکانت لە دەوری خۆت خڕ دەکردنەوە. خەڵکان وەك هاودەردی کێشەکان ڕوویان لێدەنایت. لە کۆتایی هەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان، هەموو شتەکان گۆڕان، ئەگەر بێتو کەسێکی ناودارت لەگەڵ نەبوایە، خەڵکان چی دی ڕوویان تێنەدەکردیت. ئەوە ڕۆژگارێکی زێرینی کلتور بوو، شانۆ گۆڕا، سیاسەتیش گۆڕا. دەبێت هەوڵی گەڕاندنەوەی بدەین. دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو شتانەی کە خەڵکان لە پێناویدا تێدەکۆشن. تا ئەو دەمەی لە دەوری کلتوری ئاهەنگسازی بمێنینەوە، خەڵکان دابڕاو لەگەڵ ژیانی تایبەتی خۆیان دەمێننەوە.

**گرین:** هیچ پرۆژەیەکی تازەت بە دەستەوەیە؟

**ئیڤ :** لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٠ وە بۆ ماوەی چوار مانگ بە دونیادا گەڕام، لەگەڵ ژنان دا دەربارەی ئەو ئەندامانەی جەستەیان کە بەشێوەیەکی سیستەمئامێز شێوێنراون، لە شوێنی خۆیان نەماون، کاری خۆیان ناکەن، بەخاتری ئەوەی لەگەڵ کلتوری باودا گونجاو و تەبا نایەنەوە؛ هەڤپەیڤینم سازکردووە. ئەوەی بیرکردنەوەمی سەرقاڵکردووە ژنانن لەم جیهانەی ئەمڕۆ تیا دەژین چۆن کار لەگەڵ جەستەی خۆیان دەکەن، چۆن ژنانیان بە قووڵی لە ژیانی هەقیقی خۆیان دابڕاندووە، بۆی نەکرێت دونیا بەڕێوە بەرێت، ڕابەری نەکات، لەگەڵ سیاسەت و ئایدیاڵی نوێ دا جووت و تەبا نەیەنەوە. هەر وەك لە مۆنۆلۆگی کوزدا، خەڵکان چیرۆکی خۆیانم بۆ دەگێرنەوە.

ئەو پرۆژەیە ناوی ‹›هاتنەوە ناوەوە‹ یە. پێموایە ژنان لە ترۆپکی شێواندنی کەسێتی و ڕق لە خۆ بوونەوەدا بن، لەوانەیە لەم جیهانەی ئەمڕۆماندا و زیاتر لە هەر ڕۆژگارێکی تری مێژوویی زۆرینەی ژنان ڕقیان لە جەستەی خۆیان بێتەوە، ئازاری جەستەی خۆیان بدەن، خۆیان برسی بکەن. ئێمە پێیدەڵێین لە ژێر ناوی شۆخو شەنگیدایە، بەڵام لەڕاستیدا پێموایە لەژێر ناوی خلافاندندا بێت. ئێمە زارەترەکبووین لەوەی بەرپرسیارێتی جیهان هەڵبگرین و ببینە نیشانە. ددان بەخۆدا گرتن ئاسانترە لەوەی هەڵوێست وەربگریت. بەوەش لە جەستەی خۆت دادەبڕێیت.

**گرین :** ئەو خۆخلافاندنە ژنانی دوور خستۆتەوە لەوەی کە دەسەڵات بگرنە دەست؟
**ئیڤ:** بەدڵنیاییەوە. ئەو مراندنی جەستەیەی ژنان لە هەموو شوێنێك بە ڕوونی دیارە. بۆچی لاوازبوون، دەمانەوێت ببینە چ مرۆڤێك؟
بە مانای ووشە دەستبەرداربوونە لە دەسەڵات؟ تۆ چیتر جەستەیەك نیت. تۆ لە هیچ شتێکدا نیشتەجێ نیت. تۆ بەسەرچوویت. دەبێت وەرچەرخانێك ڕوو بدات تا جارێکیدی ژنان بێنەوە ناوەوە. بگەڕێینەوە بۆ نێو جەستەی خۆمان. هەر یەك لە ئێمە، ئەو دەروازەیە بۆ هاتنەوە ژوور، ببینێتەوە. ئەوە ڕوانینی منە.

**گرین:** لە شانۆیی ئامانجە پێویستەکان، ژنانێکی بۆسنیەیی هەن. بۆ ماوەیەکیش دوو گەشتەوەری ئەمەریکی؛ میلیسا ژنێکی ئەکادیمییە، جەی ئێس کە پزیشکێکی دەروونییە، دەبنە بەشێك لەو کۆمەڵگای ژنە. دواتر دەگەڕێنەوە ئەمەریکا و جەی ئێس، لە ژوری دانیشتنەکەی خۆیدا دەبینین لە شەقامی پارك، هەمان ئەو جلوبەرگەی لەبەردایە کە لە بۆسنیە دەیپۆشی، هەست و سۆزت بەرانبەر جەی ئێس چۆنە ئایا هێشتا هەر بەشێکە لەو کۆمەڵگایە؟
**ئیڤ:** بەڵێ، پێموایە ژیانی جەی ئێس دوای گەڕانەوەی سەرلەبەری جیاوازە. پێموایە لێوانلێو بێت لە تێگەیشتن لەو کۆمەڵگایە و ڕۆحی تینوو بێت بۆ خوڵقاندنەوەی ئەو کۆمەڵگایە لە نێو ئەمەریکادا. ویستومە وا بیربکەمەوە کە چی دی ئەو پزیشکە دەروونییەی شەقامی پارك نییە و دەڕوات لە بەندیخانەیەك کار دەکات. ئەوە فەنتازیایەکی وردی من بووە دەربارەی جەی

ئێس.

**گرین** : هیچ بڕیاردانێك لە نێو پیەسەكەدا نییە، چ دەرهەق بە ژنانی بۆسنیەیی و چ دەرهەق بە هەردوو ژنە ئەمەریكییەكە.
**ئیڤ:** دەمەویێت بینەر هەم دەرهەق بە خۆی و هەم دەرهەق بە كارەكتەرەكانیش ئەنجامگیرییەكی لە لا دروستبێت و كۆتایی پرسیار بوروژێنێت ‹‹چی ڕوو دەدات كاتێك دەكەویتە ژێر كاریگەری خەڵكانێكەوە؟›› هیچ گۆڕانكاریەكت تێدا ڕوو دەدات یاوەخود تەنیا لە نێو خۆتدا بە قەتیسكراوی دەیهێڵیتەوە؟ ئایا ئەوەی لە نێو خۆتدا بە قەتیسكراوی دەیهێڵیتەوە گۆڕانگارییە؟

**گرین:** بۆچی پێتوایە ژنان لێرە و لەوێی ئەم جیهانە ئاوا بەو پەڕی سادەیی دڵی خۆیانت بۆ والا دەكەن؟
**ئیڤ** : لەبەرئەوەی من وەك بێگانەیەك خۆم ناكەم بە دونیای ئەواندا، من هەمان هەست و سۆزی ئەوانم لە گیان و رۆحی خۆما هەڵگرتووە. زۆربەی ئەو بارودۆخانەی من لەگەڵ خەڵكاندا تێكەڵاویان بووم، وەك بارودۆخی من، لاقەكراون. من لە ئاستێكی دیدا وێرانكراوم. ئەگەر چی بە دەست توندوتیژییەكانی جەنگەوە ناناڵێنم، بەڵام تا ڕادەیەك من كوژراوی دەستی باوكمم، من باوكم لاقەی كردووم. بۆیە كاتێ لەگەڵ ئەواندا بەو دونیایەدا شۆڕدەبمەوە هیچ ترس و نیگەرانییەك داگیرمناكات، بە پێچەوانەوە زۆر پێم ئاشنایە. خەڵكان هەست بەوە دەكەن ئایا تۆ سڵۆكیت یان پتەویت. لەڕاستیا، ماڵی بێجێولانەكان دڵنیاترین شوێنێكە كە من تا ئیستا پێم تێنابێت، هەروەها بەندیخانەش. دەزانم ئەوە ناوازە دەنوێنێت، بەڵام كاتێك بۆ یەكەمجار ڕووم كردە ماڵی بێجێولانەكان بۆ یەكەمجارم بوو كە هەستبكەم لە ماڵەوەم. پێویست بەوە ناكات خۆم وا بنوێنم. من هەمیشە وام هەستكردووە هەتیوێك، سارانشینێك، بێگانەیەكم. لە ماڵی بێجێولانەكان بەر ئاستێكی زۆر قووڵی ڕاستگۆیی دەكەویت، كۆمەڵگایەكی ئەوتۆ كە پێویست بە هیچ خۆ نواندنێك ناكات.

**گرین:** تۆ لە سنوورەكان دەپەڕیتەوە.
**ئیڤ:** خۆزگە دەخوازم وا بێت. وا هەستدەكەم تازە كەوتومەتە ڕێگا. ئەوەندە نابێت ئەو هەستەم لا ڕسكاوە كە

تازە دەستم لێیگیر بووبێت. ئیستا دەتوانم پیەسێك بنووسم، خەریکە لەو ئاماژەیە تێدەگەم کە ئەوە چ مانایەك دەگەیەنێت. زۆرێك لە ژیانم هەوڵمداوە بیگەمێ. بۆ هەمیشە ئەو هەستە داگیری کردووم کە دەبێت من زۆر لەمەی ئیستا تێیدا دەژیم واوەتر تێپەڕێنم. بەڵام زۆر بڕوام بەخۆم هەیە، بەتایبەتی بەرانبەر بەو شێوازە. مۆنۆلۆگی قوز، ئازایەتی ئەوەی پێبەخشیم کە بەوپەڕی ئاسودەگییەوە سەرچڵی بەرەو گەلێك سەزەمینی دی بکەم، لەبەرئەوەی تێپەڕینە بەرەو شتگەلێك، لەبەرئەوەی بۆی دەکرێت ئەو بابەتانە لە خۆ بگرێت و خەڵکان نەترسێنێت.
ئاسودەگی بۆ خۆی کلیلێکە.
زۆربەی ژیانم لە پێناوی ئەوەدا بەخشی کە بتوانم دەنگی خۆم بگەیەنم و ببمە خاوەنی دەنگو کەسایەتی خۆم. ئیستا لە شوێنێکدام کە هەست بە دڵنیایی دەکەم. من هەم، لە هەبوونی خۆم ڕازیم. ئەو درك پێکردنە بە بوونی خۆم، زۆر بە قووڵی داهێنانی لە مندا تەقاندۆتەوە و بە هیچ جۆرێك پێویستی بەوە نییە لە هێنانە دی یان لە سەلماندنی هەست بە نائارامی بکەم. ئەوەش جێی ئاسودەگییە و من هەست بە ئازادی دەکەم. من چل ساڵێکم لە ژیانی خۆم بەخشی بە باوکم، ئەو چل ساڵەی داهاتووشم هی خۆمە.




سەرچاوە و ڕوونکردنەوەکان:

١. ئیڤ ئینسلەر یەکێکە لەو نووسەرانەی کە لە ئەزموونی خۆیەوە کار دەکات و بڕوای بەوە هەیە کە هیچ تیئورەیەك لە دونیادا بوونی نییە ئەگەر بێتو بۆ خۆی هاوتا بە ئەزموونی مرۆڤ بە سروشتی لە دایکنەبووبێت. یەکێك لەو خاڵانەی کە لە ئەزموونی ئەم خانمە نووسەرە سەرنجی ڕاکێشام بوونی مۆنۆلۆگە و ئەو ئیمانی وایە هێشتا مرۆڤایەتی لەسەر ئاستی مۆنۆلۆگ ماوەتەوە و دایەلۆگ نەبۆتە گەوهەری پەیوەندییەکان. ئەگەر بێتو ئەو بیرۆکەیە لەگەلێك کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا بە قووڵی دەرنەکەوێت، ئەوا کۆمەڵگای کوردی یەکێکە لەو کۆمەڵگایانەی کە زۆر بە روونی ئەو دیاردەیەی تێدا دەبینرێت. لای ئێمە ئەویدی بە هیچ جۆریك بوونی هەقیقی

خۆی بەدەستنەهێناوە. هەمیشە لە ئەندێشەی خۆماندا وێنە و کلێشەیەکمان بۆ ئەویدی کێشاوە و لەگەڵ ئەو وێنەیەدا دواوین. لەدواجاردا چ لە زەمینەی واقیعی کۆمەڵگای کوردیدا و چ لە ئەدەبیاتیشماندا ئەویدی هەقیقی جێگەی خۆی بۆ ئەو ئەویدییە چۆڵکردووە کە خوڵقێنراوی ئەندێشەمان بووە.

٢. ڕۆژی ڤی، لە ١٤ شوبات و لە پاش نەمایشی مۆنۆلۆگی کوز لە ساڵی ١٩٩٨ بە هەزاران ژن باوەشی گەرمیان بۆ ئیڤ ئینسلەر گرتەوە و بچوکترین نهێنی نێو ژیانی خۆیان بۆ دەگێڕایەوە. لەو بەگەرمی بەخێرهاتنەوە بۆ ئیڤ و شانۆییەکەی ڕۆژێك بە ناوی ڕۆژی ڤی دادەمەزرێت و ڕێکخراوێك بۆ خۆی پێکدەهێنێت دژ بە چەوسانەوە و ئازاردانی ژنان و کچان . دواتر ڕێکخراوەکە پەل بۆ ئەوە دەهاوێت کە ببێتە ڕێکخراوێکی جیهانی گەورە. ئەمڕۆ ئەم ڕێکخراوە لە جیهاندا بە بزوتنەوەیەکی فیمینیستی گەورە ناسراوە و پاڵپشتێکی سەرسەختی ئازادییەکانی ژنانە.
(V_Day Movement)

٣. مۆنۆلۆگی کوز، یەکێکە لەو پیەسانەی کە ناوبانگێکی جیهانی گەورە بۆ ئیڤ پەیدا دەکات، ئەم دەقە لە ئەنجامی بینینی ٢٠٠ ژن لێرەو لەوێی جیهان نووسراوە . تا ئیستا بۆ سەر ٤٨ زمانی جیهانی وەرگێردراوە و لە ١٤٠ ولاتی دونیا نەمایشکراوە. ئەم پیەسە لە شانۆی برۆدوای ئەمەریکی و لە شانۆی وێست ئێندی لەندەنی نەمایشکراوە و بۆ ماوەی ١١ ساڵ لە مەکسیك و پاریس بەردەوامبووە. بێلەوەی کە چاپی کتێبەکە دوای چەندینجار چاپکردنەوە لەبازاردا نەماوە. دواتر ئەم بەرهەمە بۆ تەلەفیزۆنیش تۆمارکراوە. ئەم دەقە ٢٠ پاداشتی گەورەی وەرگرتوە و لە گرنگەکانیان پاداشتی ئۆڤ برۆدوای لە ساڵی ١٩٩٦ دا بۆ باشترین پیەسی نۆی و پاداشتی گاهنیم لە ساڵی ١٩٩٩ دا بۆ شانۆنووسین. ئەوەی ماوەتەوە دەربارەی ئەم پیەسە ئەوەیە کە ٩٠ ملیۆن دۆلاری بۆ ژنان کۆکردۆتەوە و ئەو پارەیەش خراوەتەوە خزمەتی بزوتنەوەی دژ بە توندوتیژی ژنانەوە.

**Women who write plays, Interviews with American Dramatists (An art of Theater Book**
**By Alexis Greene, p155 to 172. Published**

**.June 2001 by Smith&Kraus**

دەنووسم
یووسف

شیعر

هێرۆ کوردە

Barin 2013

# دەنووسم یووسف

## شیعر

## هێرۆ کوردە

## چاپکراوی غەزەلنووس

دەنووسم یووسف، بژاردەکەیە لە کۆی شیعرەکانی هێرۆ کوردە. ئەم کتێبە لەسەر ئەرکی نووسەر چاپ کراوە و باسم ڕەسام کاری بەرگی بۆ کردووە.

شیعرەکانی هێرۆ کوردە، شیعری ئیرۆسین و بە زمانێکی سادە، بەڵام قووڵ، شیعرییەت لە جەستە و ئەڤین و سێکس، پێک دەهێنین، بە جۆرێک، کە زمان بریندار نەبێت و ئەدەبیاتی ئیرۆسی و باڵا بەرهەم بێت. دەنووسم یووسف، بە گشتی، شیعرەکانی ساڵی ٢٠٠٩، تا ساڵی ٢٠١٢ ی لە خۆ گرتووە. نووسەری کتێبەکە، هێرۆ کوردە، خاوەنی چەندان خەڵاتی شیعر و ڕۆژنامەوانییە، لەوانە، خەڵاتی لاوی ساڵ بۆ شیعر، کە ساڵی ٢٠٠٩ پێی بەخشرا.

دەفتەرەشیعری دەنووسم یووسف، ئێستا لە کتێبفرۆشییەکاندا دەست دەکەوێت.